

ئێرەدێ نیم وەدەڕۆم میوانم ئەوەیە وێنەکەم و دیوانم

خوایە بم بەخشە ملۆن بێچمە جوزوور شەرمەسارم نییە ڕووی دیوانم

"بەناوی خوای بەرزوبێ هاوتا"

حەمدوسەنای بێ سها بە هەرشیاوی زاتی ئەڵلاّیە کە پەروەردگاری عالەمیانە وبەخشندەومیهرەبانە ومالکی رۆژی جەزایە. شوکروسپاسی ئەوبەڕی قیاس هەرشایانی شانی ئەوە کە عالەمی ئەرروئاسمانە وهەرچی ئاشکراونیهانە هەڵسووڕێنەری چەرخی رۆژ وشەوە، هەرچی هەیە دەستکری قودرەتی ئەوە، خولقێنەری مەخلووقاتە، وەدی هێنی مەوجوداتە بۆ راگەی کاینانە وپێک هێنی حاجاتە، رۆزی دەری زیندەوەرە پەروەرەری هەرچی بەشەر وگیان لەبەرە، فەرمانڕەوای عالەمیانە سولتانی هەردووجیهانە، بێ نایب ووەزیرە، بێ وێنە و بەرسوە زاناوتوانابە، ذوالجلال وبێ میسالە، ساحێبی کەمال وجەمالە، خێوی جەلال وجەبەرووتە، لەهەموو عەیبان بەری یە، کەس جێ بەدەست نیە، هەمووشت بەدەستوی یە.....

سەلات وسەلامی خودای عالەمیان بەقەدەر پەڕی گوڵی گوڵزاران وحڵی گیای مێرغوزاران وگەڵای داران وخێزی رووباران ورێژنەبارانی پاییز وبەهاران بەغووڕەم بڕژێ بەسەر گیان ولەشی پاکی خاتەمی پێغەمبەران ومەزنی سەروەران و هەڵبژێراوی ئادەمیان ورەحمەتی عالەمیان پێغەمبەری ئاخری زەماندا کە محەممەدی مستەفایە. ئەوکەسەی کە خوای بەرزو بێ وێنە لە کەلامی خۆیدا بەخولقی عەزیم ناوی بردووە و خۆی ومەلایکەی سەڵەواتیان بۆناردووە وبەسەڵەوات ناردن بۆ ئەو ئەمری فەرمووە، هەروەها بۆرووح وجیسمی ئال و بەیت وباران وئۆمەتی کە بەچاکترین ئۆمەتی باسکردووە.

سڵاوی گەرموگوڕم لە قووڵایی دڵەوە پێشکەش دەکەم بە خوشک وبراخۆشەویستەکانی ئەدەب دۆستی گەلەکەمان ئەوانەی کە بڕێک لەوەختی ئازیزی خۆیان لەپێناوی خوێندنەوەی چەند دێڕێک لەئەدەبیاتی زمانەکەمان دەنێن ودەبنە هۆی هاندان و

رابەرینی نووسەر وشاعیروهونەریان بەڵکوو خوا یاربێ تا ماون پەرە بەخزمەتی‌هونەر وئەدەبی گەلەکەمان بدەن .

ساڵی ١٣٦۴ی هەتاوی بەهۆی داخوازی خوالێ خۆشبوو مامۆستاهێمن ژیاننامەیەکی خۆم بەکورتی نووسیبوو کە لە گۆواری سروەی ژمارە ٣دا چاپکرا .هێندێک رەخنەیان لێ گرتم کەبۆچی کەمم نووسیوەو زووم کۆتایی پێ هێناوە . هێندێکیش لایان وابوو باشە وچی دیکەی ناوێ.ئەوەنەقڵێکی ختەوە بیرم کە کردووشمەتە شیعر:

باب وکوڕێک چوون بۆسەفەر
پیادەوسواریان بەنۆبە بوو
لەنۆبەی سواربوونی کوڕدا
لێی تووڕەبوومەگەر شاوسی؟
کوڕدابەزی بابی سوار بوو
پێی گوت بۆچی ئەونازداره
دووپشتەکی سواربوون ئەوجار
کوتی چاوئەو بەستەزمانە
ئەوجارهەردووکیان دابەزین
کوتی تەماشا چەن هینن !

بیلامانێ بەسواری کەر
هەرجارێ یەکیان سوار دەبوو
تووشی پیاوێک بوون لەپڕدا
باوکت دەڕوا بەپێ خاوسی
بەیەکی دیکە دووچار بوو
بە پێ یان بڕوا وتۆسوارە ؟
تووشی کابرایەک بوون رێبوار
پێوە بووە بەدەس ئەمدوانە
یەکی دی لێوی لێ گەزین
کەرێکیان بێ‌یەو نای بینن

نووسەریش تا هەر رادەیەک وبەهەرشێوەیەک بنووسێ .هێشتا ناتوانێ دڵی هەموان بەجێ بێنێ .جاکەوایە منیش هەر وەک پێشوورێگای کورت هەڵدەبژێرم ورێ لەخۆم وخوێنەر دوور ناخەمەوە .دۆستانی رەخنەگریش دەبێ لێم‌ببوورن چونکە من بەجحێڵیش هەرکەم بلێ بووم چ بگا بە ئێستە کە پیرم‌وهێزی چەنم نەماوە !

لەسروەدا گوتوومە ئەگەر بتەوێ شێوی بوورەوبەیاری زەوی وزاری ژیان بەوردی وەرد بدەیەوە تەمەنێکی دووپاتەت‌پێویستە ئەویش بەومەرجەی تەواوی رووداوی ژیانت‌پشوو بەپشوو وهەنگاوبەهەنگاو لەبیرمابێ کە ئەوەش

هەرگیز بێک نەهاتووە ونابە کەوابێ منیش یەک لەهەزار وەدەنگ لە حەرواری دێنمە ئەژمار دەنا :
وردەچیرۆکی بەسەرهاتی ژیان چاری ناکا دەفتەری حەفتامەنی!
ناوم عەبباس .نازناو وشۆرەتم "حەقیقی"یە کوڕی عەلی پاشای کوڕی سرایم ئاغای تالاو، کوڕی شێخ ئاغا ، کوڕی بەپیرەم ئاغای باپیرەگەورەی عێلی دێبوکریم .دانیشتووی شاری بۆکانم ولەسالی ١٢٨١ی هەتاوی لەدێی مەرجان ئاوای دەشتی حاجی حەسەن،ناوچەی مەهاباد هاتوومەتە سەردنیا .
دایکم ناوی زارا بووە وەختێک منی بووە تەرایی لەمەکیدا نەبووە وئەمن بەشیری دایەنێک بەناوی ئەوکەت فرچکم گرتووە. بابم باسەواد وئەهلی عیرفان بوو . دایکم نەی خوێندبوو بەلام بەقەد خوێندەوارێکی دەزانی چونکە لە مالە بابی ولەمالە بابیشم لەگەل خوێندەواران ژیا بوو.
چەند سالێک پێش شەڕی هەوەلی جیهانی بەهۆی دژمنایەتی عەشیرەیی، منیش لەگەل هۆزوعەشیرەی خۆم پەڕیوەی هەندەران بووم کە چۆنەتی یەکەی لێرەدا شیاوی باس نیە ودیزە بە دەرخۆنەی باشترە .
لەوئاڵ وگۆڕەدا مالی ئێمە دەچێتە مەرخوزی ناوچەی سەقز. منیان لەوگوندە ناردە قوتابخانە لای مەلاقادرئاغا ناوێکی ئیغلیچ کەبەداشقەی دەستی دەیان هێنا حوجرە و دەیان بردەوە مالێ .لەهەوەلەوە ٢٩ حەرفی ئەلف و بێ و سوورەی حەمد کەهەریەکەی لەدیوی تەتەلە یەک دەنووسرا پێی خوێندم دوایە "جزء عمّ" قورئان ووردەکتێبی "سمایل نامە" و " ناگهان" و"جورم‌بەخش" و"ئەی شودە"م کە هەموویان شیعری فارسی بوون خوێند ولەبەرم کردن .لەوسەروبەندە دا ئاوری شەڕی هەوەلی جیهانی گەیشتە ئێران ولەشکری تورک و رووس ولاتی ئێمەیان کردە شەڕگە .ئێمەش بازرە بووین و چووینە مەلبەندی شاری سولەیمانی .لەومانەوەدا کەلەبیرم

ئەماوە چەندی حایاند خوێندنم پەکی کەوت ، باش ماوەیەک، گەڕایەوە ولاتی خۆمان وئەوجار لەخزمەت بابم دەستم بە خوێندن کرد .

گولستان وبۆستان وکیمیای سەعادەتم لەلای بابم خوێند . دیسان چەرخ سووڕا وسووڕێکی دیشی بە ئێمەدا . رسق و نەسیبمان لە ولاتی باووباپیری هەلکەندرا و لە کۆکە و قەرەداغی ناوچەی "ئێل تەیموور"ی مەهاباد گیرساوە . لە قەرەداغ بابم ئەمری خودای بەجێ هێنا و منی بێ باب و مامۆستا بەجێ هێشت . من مابوومەوە ودنیایەک خەم وخەفەت ومالێکی پڕلە دیوانی شاعیرانی قەدیمی .بۆنەجات بوون لە چنگ خەمویەزارە وهەستی هەتیوی بەتەنیایی رووم کردە ئەوکتێبانە . بەهۆی موتالای زۆری ئەم دیوانانە وردە وردە زەوقی شیعرگوتنم بزووت وبەرە بەرە پەرەی ئەستاند . تەمەنم چاردە سال بوو کەدەستم بەدانانی شیعر کرد کە ئێستا جگە لەچەند بەیتێک لام نەماون کە لە باری ناوەرۆکیشەوە چونکە سەردەمی لاویم بوو هەر بابەتی ئەو تەمەنەیە . بڕوانە :

شەککەر شکەنی لێوت بۆ تووتیی رووحم قووت
تاری شکەنی زولفت بۆ تاری دلم مزراب
نەرگس شکەنی کالت ،کالای دلی بردم
سونبول شکەنی ئالت ئالالە دلم بێ تاب
گەرماهی موقەنەنەع بێ ،گەرمیهری موشەعشەع بێ
بنوێنە هەتا ون بن روخساری وەکوو مەهتاب

وە لە جێیەکی دیکە :

بە نووکی تیری موژگانت شەهیدو دل برینداوم
لەغەمزەی نەرگسی مەستت غەریقی بەحری حیرمانم
لەپێچی زولفی چەوگانت سەرم گۆیە لەمەیدانت
لەتاوی مەحمەری رووتە جگەرسووتاو و بریانم

بە ماتەمی بەمعی زووت لەدنیادا بەمەحرووسی
مەکە مەنعم کە وەک پەروانە سووتاوە دڵ وگیانم

ئەوەش نموونەیەک لە شیعرە فارسیەکانی ئەو کاتەمە :

سحر درگلشن ایستاد اتفاقی     کە بلبل نامەی آورد ساقی
یکی بلبل زشاخ سرو میخواند     سروی گل نواهای عراقی
کەای سنگین دل بی مهرخونخوار     نوباکی نایل هجرو فراقی
دلم هرساعت وهرلحظە هرآن     بدیدار تو دارد اشتیاقی
چون آمد اندروصل جانان     جشنی دار بهر جام ساقی
میان بستان چون توکس را نرسد     لب وچشم نکون خط وخال زیبا
قدت سروستان لبت لعل خندان     زچشمانت بنان دورلعب خوبلدا

* * *

ئەوکاتەی کە شیعرەکانم بۆ دەخوێندەوە پەسنیان دەکردم وهێنیان پتر بە شیعرگوتن عەلاقەمەند دەکرد. ئەوجار قەسیدە وغەزەل وچوارینە و پەرچیم پێدم دادەنا. غەزەلی مەولانا و جامی وغەیرەیان بە فارسی وهی "نالی" و "سالم"م بە کوردی دەکردە پێنج خشتەکی. لەو بەروبەندەدا بیستم کە خوالێ خۆشبوو حاجی بایزئاغا لە گوندی "ئیسکی بەغدا" مەدرەسەی علوومی دینی داناوە. منیش بۆ درێژەی خوێندن چوومە ئەوێ ولەگەڵ شاعیری بەرێز ودۆستی خۆشەویستم "خاڵەمین" لە خزمەت ماموستا شێخ حەسەنی شێخی دەستمان بە خوێندن کرد. بەڵام چ خوێندن بەروالەت "سەرف ونەحو"مان دەخوێند ئەمما لە راستیدا وەختی خۆمان "سەرف ومەحو"ی شیعرگوتن دەکرد. ساڵی ١٣٠٧ ی هەتاوی لەگەڵ برای زۆر خۆشەویستم ماموستا سەید کامیلی ئیمامی بەنیازی درێژەدان بە خوێندن چووینە مەدرەسەی "باحچە"ی بەشی مەهاباد . ماموستای ئەوێمان مەلا سەیدکەریمی مودەڕیسی بوو. خوێندنی ئەوێشم لەگەڵ جەنابی سەیدکامیل هەروەک خوێندنی "ئیسکی بەغدا"یە لەگەڵ خاڵەمین هەر بە شیعرگوتن وشیعرخوێندنەوە وموشاعەرەش وگاڵتە رابوارد. لەبیرمە ساڵی ١٣٠٨ بوو رۆژی

حنزنک لەگەڵ سەیدکامل حووسە حرمەت راسای سەساو ساسک حاجی باباتێج لە گوندی "حەمەبان". مەلا وەفەتی ئەو مەڵبەندە زۆرباس لەوێ بوون. رووی کردە من فەرمووی بە وەرگێڕانی ئەم دوو شیعرە عەرەبی یە کە "حضرت عایشه" لە وەسفی "حضرت محمد"دا فەرموویە ئیمتیحانی شاعیری تۆدەکەم بۆی بووسیمەوە وهەر لەو کۆڕە لەحزمەت خۆیدا وەرمگێڕاوە سەر شیعری فارسی کە لە رادەبەدەر پێی خۆش بوو وپەسندی کرد وتەحسینی کردم.

ئەو رووداوە شوێنێکی تایبەتی لە لاپەڕەی بیری مندا جێ هێشتووە. شیعرە عەرەبی یەکە و وەرگێڕاوەکەی ئەمەیە :

ولو سمعوا فی مصر اوصاف خده
لما بذلو فی سوم یوسف من نقد
لوامی زلیخا لو رئین جبینه
لآثرن بالقطع القلوب علی الاید

ئەمەش وەرگێڕاوەکەی :

اگر اوصاف خدش مصریان آندم شنیدندی
خریداران یوسف را بەپولی کی خریدندی
رخش را طعنەگویان زلیخا ار بدیدندی
بجای دستهای خویش دلها ا بریدند.

* * *

پاش ماوەیەک خوالێ خۆشبوو حاجی بایزئاغا مەدرەسەکەی ئیسکی بەغدای گوێزتەوە دێی "قولقولە" تا لەژێرچاوەدێری خۆیدا بێ وپێشنیاری بەمن کرد بچم لەوێ بخوێنم. چووم و ماوەی سالێکی لەماڵ ومەدرەسەی ئەو شادڕەوانە بووم. لەو ماوەدا وەک کوڕەکانی خۆی ئامۆژگاری کردم. رووحی شاد و یادی بەخێر.

حەوشەی حوجرەی فەقێیانلەو دێیە بە هەموو چەشنە گوڵێک رازابۆوە و دیمەنێکی وای پێک هێنابوو کە بزەی بە گوڵستانی ئیرەم دەهاتێ و روانینی ئەو روانگەیە

ئینسانی لەو عالەمەجسمانی یەدەبردە عالەمێکی رووحانی و بەراستی گەشەونەشەی بەچاوو دڵ دەدا . رۆژێکی کە لەگەڵ فەقێکانلەنێو ئەو باخچەیە دانیشتبووم ورەنگ وبۆنی گوڵان هۆش وبیری لێ ستاندبووم ئەو شیعرانەم دانا کە ئێستاش دوای نزیکەی ٦٠ ساڵ ئەو دیمەنە جوانەم لەبەرچاوی زیندوو دەکاتەوە وبرینم بەیادی لاوێتی دەکولێنێتەوە :

لالەزاری حەوشی حوجرەی قـولـقـولـە
شەرحی حالی "جنت المأوا" دەکـــا
بۆ نموونەی خولدئەگەرمەیلی هەبێ
حەق تەعالا نەخشیوا ئینشا دەکـــا
زەردوسوورکەسک وئاوی یەک بە یەک
کاری لەعل و لوئلوئی لا لا دەکـــا
لالە وژالەو وەنەوشەو نەستەرەن
هەر یەکەی مالی دلێ ئاوا دەکـــا
خەیری وخەتمی لەبازاری ئەویــن
سەربەسەر ئیستەبرەق ودیبا دەکـــا
تەختەکەی فەرشێکی سەوزی مەخمەری
حاشیەکانی ئەتلەس وخارا دەکـــا
بۆنی ریحانە ووەنەوشان تێکەڵن
عەتری گوڵ تالانە کێ داوا دەکـــا
هەرچی دەی بینم دڵم بێ ئیختیـــار
زەمزەمەی "قلنا اهبطومنها "دەکـــا
دڵ بەبۆنەی سێوی سووری کوڵمی یار
یادی عیشقی وامق و عەزرا دەکـــا
بولبولی عاشق بەبووکی سووری گوڵ
حەقیەتی ئەلحەق کەشینی وادەکـــا

ئیدی من دوای خوێندنی سەرف ونەحو ومەنتیق دەستم لە خوێندن هەڵگرت وساڵی ١٣١٣ چوومە مەهاباد ولە ئیدارەی

دارایی دامەزرام. ئەوجار ژنم هێنا ومندالم وەسەریەک نا. ئەودەم کارمەند پازدەتمەنی حقووق بوو وزۆرکەم وابوو بگاتە ٢٠ تمەن. تەنانەت رەئیسی ئیدارەش ٢٥ تمەنی پتر معاش نەبوو. ئەمیش پازدە تمەنم وەردەگرت وپێشی بەرێ دەچووم چونکە ئەودەم کەمالم لە مەهاباد بوو لە گەرەکی سەهۆڵ خانە ماڵێکی دەربەستم بەکرێ گرتبوو مانگی بە دوو تمەن!

رەفیقەکانم لۆمەیان دەکردم کە بۆچی نەچووم لە حەساری ماڵێکی دوو وەتاغ وپێشخانەیەک بەکرێ بگرم بە پێنج یا شەش قران. ئەودەم تەغاری چوارپووتی گەنم بەپێنج قران بوو، فرووحێکبە پازدەشایی یا قرانێک ومریشک بە دوو قران بوو، کەللەی قەند بەحەوت قران وگۆشت کیلۆی قرانێک وهێلکە دانەی شایی یەک وئەگەر لەسەریەک کریبات سی دانەی بەقرانێک بوو.

دانگێکی قەرەداغم فرۆشت بە سێسەد تمەن ولەبری برێک لە پوولەکەی دووسەد تەغارم گەنم وەرگرت بە سەد تمەن دە مەرم بەخوری وبەرخەوە لەنێو چوارسەد مەڕدا هەڵبژارد یەکی بە شەش تمەن بەلام بەنرخی ئەودەم هەر مەڕەی تمەنێک مەغموون ببووم وئەسپێکی چاکیشم وەرگرت بە چاردە تمەن.

بەلام کارەکەم بەدڵ نەبوو وزۆرجاریش لای رەئیسی ئیدارە گلەییم لە کارەکەم دەکرد بەلام کاری دلخوازی خۆمی پێ نەدەدام. جارێک بەدڵمدا هات نامەیەک بەشیعر لە "مەحموودی بەدر" وەزیری دارایی ئەودەم بنووسم وسفرەی دلمی لەلا بکەمەوە وهەرچی گلەیی هەمە لەبەر دەمی هەڵرێژم دەمگوت تیرێکە دەیهاوێم یا دەیگرێ یا نایگرێ. بیگرێ زۆرباش دەبێ ونەیگرێ لەوە خراپتر نابێ. لای کەس دەنگم نەکردودەستە شیعرێکم بەفارسی کە چەندبەیتێکی لەخوارەوە، دەبینن دانا وبە پۆستیدا بۆم بەرێ کرد.

درجهان الم ومحنت ورنج وشر وشور
عاقل اززندگی خویش نگردد مسرور
عاقبت در اثر گردش پرگار فلک
آرزوی توشود خاک وببادی زتو دور
ای که ازجام جهان آبگوارا طلبی
آب این چشمه گهی تلخ بودگاهی شور
تا دەگاتە ئەو جێیە کە دەڵێم :
گرچه این دایره خودنظم واصولی دارد
لیک شغلی است مرامختلف وجوربجور
گاه مامورصدی چارم وگاهی صدی سه
گاه مامور بقایایم ازاموات قبور
گاه درحومه شهرستم وگه چار محال
شهرویران وبهی،اختاچی وایل تیمور
گه بدروازه تبریزو ارومیه گهی
گه بدروازه سردشت وگهی داشتیمور
معنی گوربه گور آندم فهمیدم من
که از این پست به آن پست شدم گوربگور
وە لە ئاخریدا کوتوومە :
امر فرماکه به شغلی دگرم بگمارند
هم به ترفیع حقوقم زکرم دەدستور

لێرەدا پێویستە بڵێم ئەودەم پایەوگرووە نەبوو. لە حوکمەکەدا راستەحقووقێک دەنووسرا وچیدی . نامەکەم نارد ماوەیەکی زۆر پێچوو،وا کە خەریک بووم لەبیر خۆمی بەرمەوە کەچی ئێوارەیەک دوستێکی ئیداریم هاتە لام وکوتی فلانی ئەوە چت کردووە کوتم چۆن ؟ کوتی جا چ لەوە سەیرتر حوکمێکت بۆهاتووە کارێکی چاکیان پێ سپاردووی لەوەش سەیرتر وخۆشتر حقووقت بۆتە سی تمەن ! زانیم ئەنگاوتوومە چوومەوە ماڵ وهەواڵەکەم لەگەڵ خۆ بردەوە . ئیدی نێوان

ساخۆشی کەوتە بەینی من ورەئیسی ئیدارە کە کابرایەکی فارس بوو. چونکە بەبڕوای ئەو من نەدەبایە سەربەخۆ نامەم لە وەزیر نووسیبایە. بەڵام بۆخۆم دەمزانی دەردەکەی چیە. ئاخر من ۳۰ تمەنم وەردەگرت وئەو ۲۰ تمەن!

هەر لە مەهاباد بوو لەگەڵ کاک هەژار کە ئەودەم فەقێ بوو شناسیم پەیدا کرد. گەلێ جومعان دەهاتە لای من نوقلی کۆڕەکەمان نەقلی شیعروئەدەبیات بوو .ساڵی ۱۳۲۱ کە من بەناوی مەسئوولی دوخانیات ناردرامە بۆکان ئەویش ماڵی هاتە ئەوێ وهەموو کات پێکەوە بووین وماوەی چەند ساڵێک ژیانێکی تێکڕایی خۆشمان رابوارد. پاشان دەستی رۆژگار لێکی کردین .هەوەڵ جارێ کە کاک هێمنم دی ساڵی ۱۳۲۰ بوو بۆی گێڕامەوە گوتی لەگەڵ کاک هەژار لەخانەقای شێخی بورهان دەمان خوێند. فەقێیەک هاتە ئەوێ ئەوشیعرە بەهاریەی تۆی پێ بوو کە دەڵێ:

سەحەر لەتەڕفی بۆستان لەسەحنی لالەزارەوە
نەسیمی جانفزا وەزی بەموژدەیی بەهارەوە
زەوی زومورڕودی بووە بەفەرشی زەرنیگارەوە
وەکوو دوڕ وعەقیق ئەچن شکۆفەکان بەدارەوە
ئەوادەچێتەگوڵ چنین گوڵێ بەلەنج و لارەوە

زۆرمان پێ خۆش بوو. خێرا نووسیمانەوە ولەبەرمان کرد. ئەمن بەش بەحاڵی خۆم پێموایە زیاتر ئەوشیعرەی تۆ منی هاندا بۆشیعر کوتن. ساڵێک دۆستێکم لەمەهاباد کتێبێکی چاپی عێراقی پێشاندام کە ئەو بەهاریەی منی تێدا بوو. دیتم مامۆستا "علاء الدین سجادی" لە لێ کۆڵینەوەیەکدا رەخنەی لێ گرتووە کە حەیف پڕە لە وشەی فارسی و کەمتر لە کوردی پەتی کەلک وەرگیراوە. بەداخەوە دەنگم نەیگەیشتێ بڵێم قوربان زەمانی زوو شیعرێک پەسند بوو کەئاوا چەتوون بایە. نالی وسالم وحەریق و وەفایی وبێخود ومەحوی ودەیان

شاعیری قەدیمی دیکە ئەوەی فەرموویانە کامەی کوردی پەتی یە ؟ نالی کە وەلای سەرووی هەموو هاوچەرخەکانی کەوتووە نەتدیوە چی فەرمووە وچەندیش لەبەردڵانە ؟

نالی لەبی حەبیبە هەم تیبە هەم تەبیبە
خولاسەوولەبیبە فەرمانبەری لەبی بە

هەروەها شاعیرەکانی دیکەش هەوڵیان داوە بەسلسلەوفلفلەی گوێ نەبیستوو وچاونەدیتوو شیعری خۆیان برازێننەوە وخۆی پێوە رانێن وشانازی پێوە بکەن . ئەودەم شوێن وابوو. منیش هەرئەو شوێنەم گرتبووە بەر ئێستا دنیا گۆڕاوە وهەمووشتی لەگەڵ خۆی هەڵگێڕاوەتەوە . لەبیرمە ساڵی ١٣٢٢ شاعیری بەناوبانگ قانع ماڵی هاتە بۆکان وکرا بە مامۆستای گوندی کەلبی رەزاخان . رۆژێک کە هاتبووە لای من لێم پرسی ئێستا لەکام گوندی گوتی لە"سەگی پێشەوا" گوتم یانی چی ؟ گوتی برا دنیا دەوران دەورانە . دەوری رەزاخان پێیان دەگوت کەلبی رەزاخان ئێستا کە دەوری پێشەوایە دەبێ بڵێین "سەگی پێشەوا" .ئەمما منیش ساڵی ١٣٠٠ هەردەبوو بەوشێوەیە شیعر بڵێم .بەڵام ئێستا بزانن شیعرەکانم هەروان ؟

ساڵی ١٣٠٩ ئەودەم کە قوتابی علوومی دینی بووم ئەو غەزەلەی نالیم کردە پێنج خشتەکی کە دەڵێ :

لە دوگمەی سوخمە دوێنێ نوێژی شێوان
بەیانیدا سپیدەی باغی سێوان

ئەو تەخمیسە کەیبووە دەست خوالێ خۆشبوو "سەیف القضات" ، فەرمووبووی دەڵێی هەموو تەخمیسەکە لەتەبعێک هاتۆتەدەرێ بە حەقیقی بڵێن "حەسەن" تەحسینت دەکا . مامۆستا هێمن کە موخالیفی تەخمیس بوو ولای وابوو تەخمیس وەکوو ئەوە وایە نانی خۆت بەری لەسەر سفرەی خەڵک بیخۆی جارێک بۆی گێڕامەوە گوتی لە عێراق شاعیرێک هاتە لام . غەزەلی

شاعیرێکی کوردی تەخمیس کردبوو. بۆی خوێندمەوە و بەزەری پێ وتم ئەمن تەنیا بە جوملەیەک وەڵامم داوە کە " هەر حەمدی حەقی تەخمیسی هەیە وبەس" وبەندێکی تەخمیسەکەی بۆم لەسەر شیعری سالی بۆ خوێندەوە کە دەڵێ :

لەبەر ئەبرۆی کەوان و تیری سەر زێت
هیلال ئەوشۆ بەخۆی گوت تەنگ ئەبێ جێت
خری رووبەند وکاتێ کەوتە بەرپێت
لەخەوفی تەلعەتت رۆژ هەر وەکوو شێت
بەروو ڕەردی هەڵات و کەوتە کێوان

هەڵبەت مامۆستا هێمن لەڕادەبەدەر لوتفی لەگەڵ من بووە دەنا بۆخۆم پێم وانیە. ساڵی ١٣٢٨ مامۆستا گیوی موکریانی لە هەولێرڕا نامەیەکی بۆ نووسیم وبەدەروێش سمایلی سەرمابردووی دەف زەن ودەنگ خۆشی بەناوبانگی ئەودەمدا بۆی ناردمە بۆکان ولەودا داوای کردبوو وێنەوشیعرو بەسەرهاتی خۆمی بۆ بنێرم کە لە چاپخانەکەی خۆی لە هەولێر لەچاپی بدا
بەداخەوە لەو سەروبەندەدا کە ئەوبەڕی زوڵم وزۆر و بگرەوبەردەی ڕژێمی شایەتی بوو نەمتوانی حەتتا وەڵامی نامەکەشی بدەمەوە ولەبەرخۆمەوە گوتم "هەولێرەوە دەروێش سمایلم کە خۆی شاهیدی هەوروهەڵا بوو لێ ڕاسپارد کەحاڵەکە ئاوایە وناتوانم ئەمرەکەی بەجێ بێنم لێم ببوورێ. تەنگ وچەڵەمە وهەوروهەڵای ڕژێمی شایەتی هەر ئەو زەرەرەی لێ نەدام کە نەمتوانی شیعرەکانم بنێرم بۆ مامۆستا گیو بەڵکوو زەرەری لەوانە گەورەتری لێدام کەقەت نەمتوانی جێگای پڕ کەمەوە. ئەویش فەوتان ولەبەین چوونی زۆربەی ئەوشیعرە نیشتمانیانەمە کە هەموو لەجێ وکاتی خۆیدا ، گوتبووم. بەڵام چونکە ماوەیەک لەژێر چاوەدێری جاسووسانی شادا بووم ئەوی بووم سووتاندم وئەوی ماوە ودەی بینن وێنەیەکی زۆرکەم لەوانەیە کە لەسینگی خەڵکم دەرهێناوە -

ئەوە وهێناومەتەوە سەرکاغەز. خەوی غەفلەت سەردێری شیعرێکە کە لەساڵی ١٣٢١ ی هەتاوی بەسوورەتی نەرحیع بەند گوتوومە وپێنج بەش کە ئەودوانەیانم بە ناتەواوی وەگیر کەوتۆتەوە :

بەشی یەک

نەوبەهارە و گوڵەکان پشکووتن
سوێسنە ونەرگس و نەسرین لەنوێ
لالە و گوڵ دەدرەوشن لە چەمەن
وەکوو ئەستێرە بەتاریکە شەوێ
بۆنی وەک عەترە نەسیمی سەحەری
پێش گزنگی کە وەکێوان دەکەوێ
نیشتبوو بولبولی شەیدا لەگوڵێ
وای دەفەرموو لەزمان خاسەکەوێ
نەتەوێ گەر هەموو دنیات بدەنێ
بەدڵێکی بەخەم و لێرو لەوێ
دێتە گوێم دەنگی فریشتەی رەحمەت
بە هەموو نەزمێ دەڵێ وناسرەوێ
خەوی غەفلەت بەسەهەستن لەخەوێ
گەر ژیانێکی بە ئازادوو دەوێ

بەشی دوو :

پیرەمێردی خەرەفی زستانێ
هاتە ئاخر نەفەسی گیان دانێ
باغی رازاندەوە نەققاشی قەدەر
بەگوڵ و یاسەمەن و ریحانێ
شای گوڵان چادری هەڵدا لە چەمەن
لەشکری لالە لەپای کوێستانێ
لە گەڵای سێوەرە شەونم دەکەوێ
قەترە قەترە بە نمەی بارانێ

با بەرێ نوێی هەڵاڵەوبەیبوون
ئابرووی عەتری گوڵی کاشانێ
پێم دەڵێ هاتفی غەیبی لە نەکاو
نیە بۆو دەردە مەگەر دەرمانێ
خەوی غەفڵەت بەسە هەستن لەخەوێ
گەر زیانێکی بەئازادوو دەوێ

زۆرجاریش بە پێشنیاری دۆستان سەرگورشتەو بەسەرهاتی جۆراوجۆرم کردووە بە شیعر. یەکێ لەوانە "فەقێ وتەپکەچی" ـ یە کە لە کتێبێک بەناوی "زهرالربیع"دا دیومە و بە پێشنیاری خوالێ خۆشبوو مەلاحەسەنی قزلجی کردوومە بە چیرۆکێکی "٢٠٠" بەیتی کە ئەوەش هەروەک زۆربەی شیعرەکانم باسی قازانجی زانین وفێربوونە. چونکە بەبڕوای من هۆی دواکەوتن وچارەڕەشی وژێرچەپۆکەبوونی گەلەکەمان تەنیا نەخوێندنە ومانەوە لە شەوەزەنگی نەزانی وبێ خەبەری دا. ئەو چیرۆکەم بەو شیعرانە کۆتایی پێ هێناوە :

تۆپێت وانەبێ خوێندن بازییە
خوێندن کارخانەی ئادەمسازی یە
خوێندن سەرمایەی زین وحەیاتە
خوێندن پێک هێنی هیواو ئاواتە
خوێندن ئاوێنەی بێ وێنەی هاتە
خوێندن ئاوێتەی نوقڵ و نەباتە
نەکێو نەچێوە بڵیند و بەرزە
سەری لە ئاسمان بنی لە ئەرزە
زەوی ئاواکرد بەبێ هەراوبانگ
دای لەشەقەی باڵ چووبۆکووی مانگ
وێستاون لەوێش بەسەف موشتەری
دەڵێن چاوەڕێن زوهرەو موشتەری
هیواپێک هێنە مایەی بژیوە
وەک رۆژ رووناکە ولەچاو نەدیوە

نێوی زانینە و بە بۆنەی وینە

لەبەحری بینەو لەحەو بەدیمە

بەرێی زانینمدا رۆیی بۆ سەما

ئیگاەی زاتا بە رەفیق و سەما

وادیارە چەنەم هێشتا هێزی تێدا ماوە چونکە زۆری لەبەر

رۆیشتم وگەلێکم تاریفی خۆم کرد وسەری ئێوەم ئێشاند .

بەلام ئێستا دلتەزێن ترین رووداوی ژیانم بۆ بگێڕمەوە .

تازە نامەیەکم لە مامۆستاهێمن نووسیبوو ولەودا دەعوەتم

کردبوو بێتە بۆکان کە هەوالی کۆچی دوایی ئەوبان بۆهێنا .

ئەزنۆم نوشتاوەوبێ ئیختیار سێلاوی فرمێسکم بە چاودا

هاتە خوار :

حەقیقی چاوەڕێی دیداری تۆ بوو داخی داخانم

نەنیشت ئەو بازەبەختی من لەبەختی بەدئیما تاکەم

بەداخ وکەبەرێکی بەقورسایی تەواوی کێوەکانی کوردستان

وەک بۆخۆی گوتەنی مەرگ مۆلەتی نەدا ئەمێکی تر لەبەر

کێکی تەمەنی هەلگرێ . کاخی فەرهەنگ وئەدەبی گەلەکەمان

رووخا . خەرمانی سووری ئاوات وئامانجی بیر و گەنجی

ئەدیب وئەدەب دۆستی گەلی کوردی لافاوی ئەجەل رایدا و

بردی. هێمن کۆچی دوایی کرد وجەرگی دۆستانی بەداخی

جودایی خۆی بە کوچکیەوەدا و نالەی جودایی بۆ بەجێ

هێشتین . سەعدی دەلێی ئەوشیعرەی بۆئەم رووداوە داناوە

رفتی و ماند مارا نار غم تو در دل

ازکارزوان نماند جز آتشی بەمنزل

لەخوای مەزن داوا دەکەم ئەو رووحەبەرزە بخاتە بەر رووحم

وکەرەمی خۆی وبەبەهەشتی شاد بکا .

من لە سالی ۱۳۴۲ دا بازنشەستە بووم وئێستا کە هاوینی

سالی "۱۳۶۵"ە وتەمەنم گەیوەتە ۸۴ سال تازە بەنیوە ونیوە

چلێ خەریکی کۆکردنەوەی شیعرەکانم ونووسینی ئەم

سەرگورشتەیەم کە بڕیار وابوو مامۆستا هێمن چاپیان بکـــا. ئێستاش بەیاد وبیرەوەری ئەو خۆشەویستە هەر دەی سپێرم بە شوێنەوارەکەی ئەو ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی "ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی" . دیارە هەرکـەس یا هەر نووسەر وشاعیرێک لە رەخنە وپێشنیار بترســـێ مەبەستی نووسین وخزمەت بەگەلەکەی نیە بەڵکوو خۆنواندن و پاڵەوان پەمۆساز کردنە . جا بەوبڕوایەوە هەرکەس بەوردی و بەچەشنێکی عیلمی وشاعیرپەسندانە نەقدی لەسەر دیوانەکـەم هەبێ پێم ناخۆش نیە وپێی دەڵێم دڵسۆزێکی "حەقیقی" .

بۆکان - هاوینی ١٣٦٥ی هەتاوی

* * *

## موناجات

به ناوی خوای مه‌زن ئه‌و پادشایه
که ته‌نیایه وشیای حه‌مدو سه‌نایه
سپاسی ئه‌وپه‌ڕی شایانی به‌رزی
په‌ڕی مێشووله‌یه بۆ شانی به‌رزی
ئه‌وه په‌روه‌ردگاری عاله‌مینێ
هه‌یه وهه‌بوه‌وده‌بێ وده‌بیه‌وده‌بینێ
به‌روحم‌ومیهره‌بان و موسته‌عانه
ته‌جه‌للای نووری عه‌رزو عاسمانه
خه‌دیوو خاوه‌نی رۆژی جه‌زایه
نه‌زاو خێوی به‌زه‌ی ئه‌هلی نه‌زایه
ئیلاهی چاک وپاک وچه‌وت و بێخود
هه‌موو هه‌ر عه‌بدی تۆین"ایاک نعبدُ
به‌یاری و رێ نوێنێ تۆ نیازین
به ره‌حمان وره‌حیمی تۆ ده‌نازین
که‌ره‌م که‌ی شاره‌زاییمان له‌ڕێی راست
به‌ڕێی "انعمت"دا بۆچوونی جێ راست
ببووری وانه‌که‌ی مه‌غزووبی تۆبین
له‌ڕێ لامان نه‌ده‌ی یاڕه‌ببی ئامین

خودایا هەرلەتۆ خوایە خودایی
لەسەر تەختی جەلال وکیبریایی
ئەزەل هەرسووی خودایی شانی تۆیە
ئەبەد هەر هەی سەنا شایانی تۆیە
خودایی هەربەشی تۆیەوئیتر بەس
هەموو کەس تۆی کەسەئەمماتۆکەس
خودای ئاوو زەوی وحەوت ئاسمانی
خودای بەرزونەوی وچی خۆت دەزانی
وەدی هێنی هەموو بوون ونەبوونی
بەری زاتت لەماندوویی وزەبوونی
هەموو مەوجوودی عالەم تۆ دەناسێ
لەئاساری عەجیبت سەر دەماسێ
نیە وێنەونموونەت نیتە هەمدەم
نیەلای تۆ خەوو خواردن زەمو دەم
نەدیوو دیمەنی نێو بەحرو نێو بەر
لەخەلق وئەمری تۆن "اللەاکبر"
بە تۆیە عیززەتوزیللەت بەم وبەو
بەتۆیە نووری رۆژوزولمەتی شەو
لەسەر کوللی دەروزووری هەناسە
وجوودت واجبی شوکر و سپاسە
خەجالەت بارو شەرمەندەم لەبۆچی
ئەمن چی ووەسفی تۆمن چی وئەتۆچی
لەنەختێ ئێسک وپێست وچۆرە خوێنێ
منی عەبدی نەزان چۆنت وەخوێنێ
بەشەر چۆنت بکا وەسفی کەمالی
بەفیکری کاڵ وئەندێشەی بەتالی
سەنا بۆتۆ نەوێنەی قەترەیەو یەم
لە زەڕڕەش کەمترە خورشیدی عالەم

خودایا من بەتۆ ئومێدەوارم
بە رەحمان ورەحیمی تۆبە کارم

ئەتۆ زانای هەموو رازی نیهانی
گوناهی من لەمن چاتر دەزانی

گوناهم زۆرە هاتووم سەرەشۆڕی
لەرێگا راستەکەت رێملێ نەگۆڕی

خەتابارم خودایا لێم ببوورە
لەدیوانی خودایی کینە دوورە

ئەمن عاسی ونەزانم تۆ غەفووری
گەلێ دوورە لەعیسیانم نەبووری

بەقەولی داوتەپێم دڵ خۆشە "باللە"
وتت "لا تقنطوا من رحمت اللە"

بەهیوام ئەودەمەی گیانم دەسێنی
نەجاتم دەی بە ئەلتافی نهێنی

خوداوەندا بەحەققی بێ نەزیریت
بە حەققی پادشایی وبێ وەزیریت

بەزاتی پاکی بێ وێنەو میسالت
بەعیلم وقودرەت وجاەو جەلالت

ئەتۆ کردت بەگوڵزار ئاوری کڵ
لەبۆ ئاور بەنێو ئاوا دەبەی گڵ

لەئیبراهیمی تۆ ئاور بووە عەون
بەعەونی تۆلەلەی مووسایە فیرعەون

بەهۆی "اقرا" دەزانێنی بەموخبیر
بە"مدثر" دەفەرمووی "قم‌فانذر"

لەخەو هەستە بلێ هەرچی مەبەستە
بناسێنە، بترسێنە ، مەوەستە

بەحەققی سوورەیی" الحمد"و" اخلاص"
بەسوورەی "فاتحە"تا سوورەیی"ناس"

بەحاسمی لەمەت ساها وباسر
کەحەڵقی گوڵلی مەحلووقت لەبەروبی
بەحەقی سوورەی "انا فتحنا"
بەوانەی سوژدەیان راسی ئەمەن سا
بەماڵی کەعبەوو "بیت المقدس"
بەرووحی ئەنبیا هەرچی تیا هەس
بەحەقی گوڵترزی رەهبەراست
محەممەد جانەمی پێغەمبەراست
بەحەقی مەهبەتی "روح الامین"ت
بەحەقی "رحمة للعالمین"ت
بەحەقی چوار یاری یارو یاوەر
ئەبووبەکر وعومەر، عوسمان وحەیدەر
ئەوی دیکەش لەیارانی وەفادار
بەشارەت بۆ دراوانی ئەش و چوار
بەحەقی ئال وئەسحابی کیرامی
حسووسەن هەمزەوعەبباسی مامی
بەدووخونچەی گوڵی رەورەی جینانت
بەوەی پێغەمبەری ئاخر زەمانت
بەئیمانی ئەوانەی خاسی ناسن
بەچاکانێ بەچاکی تۆ دەناسن
بە ئوممێدی دڵانی پڕ لە ئیمان
بەشەرمی شەرمەسارانی پەشیمان
بەوانەی دێنەدەربارت بەرووی سوور
بەوانەی رادەوەستن مل کەچ ودوور
بەوانەی "قائم اللیل"ن بەبێ خەو
بەوانەی "صائم الدهر"ن هەتا شەو
بەچاوی پڕلەفرمێسکی سەعیران
بەرووی زەردوهەناسەی ساردی پیران

به ناموّیی ئه‌سیرو خوّف و ترسی
به‌که‌م‌رووبی عه‌ریبی رووت وبرسی
به‌وانه‌ی پیره دلّیان و مالّن
به‌وانه‌ی زوّر‌مالّ وئه‌هلی حالّن
به‌وانه‌ی حوّت ده‌یان‌ناسی وده‌زانی
له‌گه‌لّیانا هه‌ته لوتفی نیهانی
له‌چاکه‌ی چه‌ک کراوم رێ به‌ترسه
له‌تاوانم ببووره ولێم مه‌پرسه
دلّوّپێکه هه‌زاران به‌حری بێ بس
له‌ده‌ریای ره‌حمه‌ت جوون وچرا چن ؟
په‌لّه‌ی هه‌وری که‌ره‌م چی لێ ده‌بێ که‌م
په‌لّه‌ی ره‌حمت‌بدا سه‌رجه‌م له‌عالم
له‌کن تیشک وترووسکه‌ی خوّرو نووری
چ فه‌رقێکی هه‌یه نیزیک و دووری
عیبادی توّ ئه‌وه‌ی بوون وهه‌ن ودێن
به‌مه‌یلی خوّ نه‌بوون ونیس وناهێن
له‌خانی بێ دریغت جیره خوّرن
له‌بوّ عه‌فوت که‌من هه‌رچه‌ندی زوّرن
به‌شی چاورێخشانی توّبه‌بێکه
به‌کوردی سه‌دگوناه و توّبه‌یێکه
له‌قاپی ره‌حمه‌تی توّ شا ، گه‌دایه
گه‌دای "الفقروفخری" پادشایه
که‌رامه‌ت بوّ که‌ریمان شوێن وره‌سه‌د
فلاتنهر ، که‌لامی توّیه به‌سه‌
ره‌وی وزاری عیباده‌ت وبه‌شکه دێره
به‌لّکی هه‌وری ره‌حمه‌ت بوّ بنێره
به خورپه‌م رێزه‌یه‌کی لێ ببارێ
ئه‌م وزه‌یه‌کی گوناهی لێ ببارێ

سەراسەر کردەوەی ژینم بەرۆشـــە
چ خۆشە عەفوی تۆ بۆم بێ بەتۆشـە

لە هەرکەس تۆ بپرسی کاری نەخشین
چیە فەوری دەڵێ جێی تۆڵەبەخشین

دروستی دەستی تۆم وتۆ دەناســم
بەدەس تۆیە سبەینێ باس و خواسم

بە"انا" ووبە"للە"مانە ئیمــان
"الیــەراجعــون"ە ئاخـریمــان

حەقیقی ئەوسەری عسیانە بــاری
وەلێکن بێ سەرە ئیحسانی بــاری

شای ئەنبیا محەممەدی موختار و سەروەرە
سەر حەلقەیی نبووەت و مەحبووبی داوەرە
لەوح و قەلەم لە عەقلّ وکەمالی سەنادەکەن
عەرشی بەرین لەنووری جەمالی مونەووەرە
سولتانی ئەنبیایە لەئادەم هەتا مەسیح
فەرمانرەوا و خاتەم و سەردار و سەروەرە
ئەو مەحرەمەی لەبەیتی حەرەم فەخری عالەمە
بۆ ئەنبیا لە مەسجیدی ئەقسایە رەهبەرە
بەدری دوجایە بۆشەوەزەنگی زەلال و کوفر
شەمسی زوحاو مەزهەری میحراب و منبەرە
نوورێکە سێبەری نەبووە فەخری کاینات
ئەممالەرۆژی حەشر پەنا و پشت و سێبەرە
بێ وێنە وێنەیێکە لە ئاوێنەیی کەمال
نووری جەمالی سانیعی تێدا موسەووەرە
گەر مانگی ئاسمان هەیە نووری لە رۆژەوە
مانگی زەوی لە نووری تەجەللا مونەووەرە
خالق ئەگەر بەخاتری خەیرولبەشەر نەبا
کاری چبوو بە خیلقەتی ئەم حەوت پەیکەرە
ئەی سەییدی بەشەر شەوی ئەسرا مەقامی تۆ
عەرشی عەزیم وبارگەهی حەیی ئەکبەرە
هاورێ بوو جەبرەئیل وبەجێ ما لەنیوەرێ
تۆ رۆیی ئەو ئیزن نەدرا بچتە ئەو سەرە
قوربان لەسیدرە سەدرنشینی موقەرەبی
ئەو مەسندو سەدارەتە بۆ تۆ موسەددەرە
هەرچی سیفاتی چاکە خودا دای بە ئەنبیا
تۆ وارسی ئەوانی بەتۆ گەیوە یەکسەرە
ئەمری خودا بەناردنی رەحمەت لەرووحی تۆ
ویردی سەفی مەلاییکە تا رۆژی مەحشەرە

پەرگاری نەخشەکێشی سرۆی تۆیە مانگی نوێ
ئینجا لەرووت مونەووەرە کاتێ مودەووەرە
"ام‌القرا" بەرۆڵەیی وەک تۆ فەخر دەکا
یەسرب مەتاعی قودسە بەڕەوزەی موتەهەرە
ئەو ئاوو خاکە جەننەتی مەوعوودە بێ گومان
ئاوی مەعین و کەوسەرە خاکی موعەتتەرە
خولقی عەزیمی بۆیە لەدیوانی عەدڵی تۆ
ئەیدادگەر، غەزالە تەمەننای موبەسسەرە
مەحکەم دژێکە ئەمر بەمەعرووفی دینی تۆ
مولحید دەژی کەسێکی دژی نەهیی مونکەرە
ئاور بەئاورێ لەگوناهی مە، لادەدا
ئاورێ دەوە، کە ئاورێ تۆ سۆمە، لەمپەرە
فیدیێکی عەیبدارە حەقیقی قەبووڵی کە
فەرموو گوناهبار و پەشیمانەکەم وەرە

بۆکان ١٣٤٥ی هەتاوی

واجمل منک لم ترقط عین      واکمل منک لن تلد النساء
خلقت مبرئا " من کل عیب      کانک قد خلقت کما تشاء

وەرگێڕاوی حەقیقی بە کوردی

جوانتری لەتۆنەدیوەقەت چاو      لەدایکی نەبووە کەس بەوێ شیاوی
خەلق کرای بەری لەکوللی عەیبێ      دەلێی بەکەیفی خۆت خەلق کراوی

وەرگێڕاو بەفارسی

جمال چون ترا ندیدە دیدە      نزادەمام چون توبرگزیدە
بری زعیبت آفریدە گویی      خدا بەمیل خویشت آفریدە

بوکان -٢/١/٦٦

مەدحی حەزرەتی رەسوول (د.خ)

لە زمانی حەزرەتی عایشەوە

ولو سمعوا فی مصر اوصاف خدە
لما بذلو فی سوم یوسف من نقد
لوامی زلیخا لو رئین جبینە
لاثرن بالقطع القلوب علی الاید

وەرگێڕاوی حەقیقی بە کوردی

لەمیسرێ بیستبایان ئەودەمی وەسفی جەمالی ئەو
بەبێ شک بۆ کڕینی یوسفی کەس نەیدەدا پارە
ئەوەی لۆمەی زولەیخایان دەکرد ئەویان بدیبایە
لەباتی دەس بڕین جەرگ ودلی خۆیان دەکرد پارە

وەرگێڕاو بە فارسی

اگر اوصاف خدش مصریان آندم شنیدندی
خریداران یوسف را بە پولی کی خریدندی
رخش را طعنەگویان زلیخا ار بدیدندی
بەجای دستهای خویش دلها را بریدندی

گوندی جەمیان - ١٣٥٨ی هەتاوی

سەنای بێ حەد بۆ زاتی بێ چوون
"سبحان اللە عما یصفون"

مالک الملکی بێ شا و بێ شەریک
لە عەیب و عاران موبەڕا و بەریک

دانەری زەوی و حەوت ئاسمانە
بێ جێ و مەکانە خۆی بێ مەکانە

هەڵسووڕێنەری چەرخی ڕۆژ و شەو
لە عەرز و ئاسمان کێیە غەیری ئەو

تاک و بێ هاوتا پاک و بێ باکە
خالقی ئاو و خاک و ئەفلاکە

سەلات و سەلام لە سەر مستەفا
ڕەسوولی ئەکرەم خەتمی ئەنبیا

بباریٚ دایم وەک ڕێژنەی باران
سەدهەزار هێندەی خێری ڕووباران

جێژنی مەولوودی فەخری عالەمە
ڕووناکی چاوی حەووا و ئادەمە
ڕەحمەت بنێرن بۆ نووری هودا
صلوا علیە فەرمووە خودا

مزگێنی هێنا عیسای موجەڕڕەد
"یاتی من بعدی اسمە احمد"

مزگێنی هێنا ورۆیی بۆ فەلەک
لێرە بۆ بەشەر لەوێ بۆ مەلەک

یانی دوای من دێ ئیسم ئەحمەدێ
لەوچاتر نەبی نەهاتووەو نەدێ

ناوی محەممەد نێوبانگ ئەمینە
لەقەب رحمة للعالمینە

تەنیا گەوهەرە لەنێو بەحرو بەڕ
هەڵبژێراوی اللە اکبر

شەوی زهووری ڕەحمەت دەبارێ
نوور شەبەق دەدا زوڵمەت دەتارێ

٥٧٠ منـــــزووی زابینـــــــــی

هەڵگـــرا چـــرای دینـــی موبینـــی
هەرئەو ساڵەی بوو حەملەی عام‌الفیـــل

ساڵـی واقعـــەی طیـــراً ابـــابیـــل
بـــه شـــەوی ١٢ ی ربیــــــع الاول

ڕۆژی دینـــی حـــەق سەرکـەوت‌لەکـەل
لەشەڕی و عەڕەب‌و بیریـــک و دووری

دنیـــا ڕوونـــاک بوو بـه قوببەی نووری
لە ڕۆژئاوا را هەتا ڕۆژ هـــــەڵات

مـەلـەک داوەری شـەیـاتیـں هـــەڵات
حـزبـی مـەولــوودی فەخری عالـەمـە
ڕوونـاکـی چـاوی حـەوواو ئـادەمـە
رەحمـەت بنێرن بـۆ نووری هـــودا
طـــواعلیـــه فـەرمووه خـــودا

جاء بـا الـهدی فـــی ام القـــــرا
نـــور مثلـــه عیـــن لـــم یـــــرا

ئـــاوری ئـاورگـی گـاور کـــــوژاوه
ڕۆچـوو هـەڵچـۆرا دەریـاچـەی ساوه

تـــەقـــی درزی دا تـــاقی نـــۆشیـــروان
یـانـی ئیعجـازی نـــەبـــی نۆشیروان

هـەڵبـوو چلـــچرا لـــە جێگـەی ئـاور
گـــڕی دامـــرکـــا چـۆڵـە چرای گاور

عوزا بـێ عیززەت ،مەنات بێ مـــەنـات
هـەبـەل بـێ بـەهـا نـەمـا قەدری لات

تاجی لەسەرنـا شـای اولـوالعـزمـــان
چـەمـان پەرچەمان چەم و خەم نـەمـان

سەمەکتا سەما رەقس وسەمایە
جێژنی مەولوودی رەسوول اللەیە
جێژنی مەولوودی فەخری عالەمە
رووناکی چاوی حەوواو ئادەمە
رەحمەت بنێرن بۆ نووری هودا
صلوا علیە فەرمووە خودا
سوورەی والشمسێ قەسەم بە رووتە
والیل اذا سجا بە مووتە
لەنێو ئەنبیا دوڕڕی یەتیمی
خودا فەرموویە خولقی عەزیمی
شفاعەتی تۆ بۆ تۆبەی ئادەم
قەڵەم لە لەوحی نووسیبوو ئەودەم
خودا ناخودای کەشتی کردە نووح
تۆ سەوڵت لێدا بە عالەمی رووح
لە ئیبراهیمێ ئاور بەکوڵ بوو
نوورت لەسەینا پەرژینی گوڵ بوو
میقاتی مووسا عەرزە و کێوی توور
جێی تۆ سیدرەیە و سەراپەردەی نوور
بەئاوی دادا مووسا دەستە گوڵ
پێشوازی کردی عیسا یەک مەنزڵ
مانگ تۆی دی حەق بوو بێژێ من نیمە
نەی گوت جەزای بوو کردت دوو نیمە
تۆ بووی پێ ڕاگەی سکاڵای خەزاڵ
لەسەر تۆ خەتمە موعجیزەی کەماڵ
جێژنی مەولوودی فەخری عالەمە
رووناکی چاوی حەوواو ئادەمە
رەحمەت بنێرن بۆ نووری هودا
صلوا علیە فەرمووە خودا

کوڵی بۆن خۆشی ساغی کیبریا !
ڕووناکی شەمعی جەمعی ئەنبیا !
شای تاجداران بەتەخت وئەورەنگ !
نەخشی تایبەتی نەققاشی یەکرەنگ!
شیرەی شیرینی شرابا " طهور
سوورەت ڕۆژی ڕوون نووری عەلانوور!
مەزەوتامو بۆی جۆی شیروهەنگوین !
ساقی کەوسەر وتەسنیمو مەعین !
تەنیا گەوهەری دەریای کەرامەت!
ئالاهەڵگری ڕۆژی قیامەت !
چرای "بیت اللە" نووری مەدینە !
پەیکی ڕەحمەتت ڕووح الامینە
لەبەر تۆفەرمووی خودای پاک وتاک
"لولاک لما خلقت الافلاک "
خوڵقت عەزیمە ، لوتفت عەمیمە
تەبعت کەریمە من خەمی چیمە
ترسی مە شەرمە لەڕۆژی ئەژمار
خودا بەرەحمە وئەتۆش تکاکار
بەڵام زۆر خێرە چاکەی نەهێنی
تۆخوا لای چاکان نێوم نەهێنی
خاکی دەرگاکەت لەعلەو پیرۆزە
ڕووحم فیدات بێ جێژنە پیرۆزە
جێژنی مەولوودی فەخری عالەمە
ڕووناکی چاوی حەوواو ئادەمە
ڕەحمەت بنێرن بۆ نووری هودا
صلوا علیه فەرمووە خودا

ئەومانگە مانگی "رحمة اللـه"یە
مانگی میعراجی رسول اللـەیە
بیست وحەوتەم بوو جەبرەئیلی ئەمین
هێنای فەرمانی "رب العالمین"
عەرزی کرد سەلام یا "رسول اللـه"
دەعوەت کراوی بۆخزمەت "اللـه"
فەرموو خۆسارکە بەوەجهی لازم
بوڕاق حازرە و منیش مولازم
لەحورمەت دام تاجێکەی موجار
هەتا نیزیکی سەراپەردەی راز
کردی حەرەکەت رەسوولی کەریم
بێ چوون و چرا بۆ عەرشی عەزیم
شەوی میعراجە وشاسواری بوراق
رێبواری رێگای بەرزترین تاق
رۆیی بۆخزمەت حەزرەتی باری
لە عەرش و کورسی رەحمەت دەباری
بەشەوقی لالەی "لیلە الاسرا"
بوو بە چراغان سەراو سەرسەرا
تا حایل نەبێ بۆ حوزووری حەق
پەردە لادران تەبەق دوای تەبەق
رووحی ئەنبیا و چاکان و پاکان
بەدینی شادبوون سڵاو لە پاکان
سەفی مەلایک چوونە پێشوازی
باڵیان رادەخست بۆ پایەندازی
هاواری کردێ هاوڕێ جەبرەئیل
یا "رسول اللـه" دەخیل سەد دەخیل
ئەگەر بەولاتر بەموو تێ پەڕم
بە نووری یەزدان دەسووتێ پەڕم

شەوو شەو ڕەوی شیاون لــــــەوی
جوانی فەرمووە مــــەولا مەولەوی:
"چوو دیتی و گوتی وبیستی وگەڕیاوە
حەلّقەی درگاکەی هەر ئەلەریــاوە"
سەدوبیست وچوارهــەزار پێغــەمبــەر
ئەتۆیان بوویە ئیمـام و ڕەهبــەر
خەلآتی هێنـا جـەبـریلـی ئـەمیـن
لەقەب دوای لەقەب "طەویـاسیـن "
یارەب بە حەققی ڕەسوولّی ئەکـرەم
بە " خیرالبشر" ،"شفیعالامــــم"
یارەب بە حەققی حـەبیبـی بـاری
بە ئال و بەیت و بە چوار یـاری
لە بەحری عەفوت نەمێک یەمێکـــــە
کەرەمکە ، لای تۆ یەمێک نەمێکـــــە
دەریای ڕەحمەتت بـێ سـەروبنـــــە
تۆ بێ نیازی، بۆ ئی وەک منـــــە
بۆخۆت دەزانـی خـەجالـّەتبــارم
بــە لوتفـی خەفیت ئـومێـدەوارم
گونـــاهـــم زۆرە دەزانــــی رازم
تۆی کـارسـازم بـەتـۆ دەنـــازم
حەکیم نەخۆشم دەردم گـرانـــــــە
چارەی نەخۆشی دەوا و دەرمـــانـــە
بە "لاتقنطو من رحمت اللـــــــــه"
ئـومێـدەوارم نـاتـرسـم لـەولا
نەبی شەفیعە و ئەتـۆ شەفیقی
یەقین دەبـەخشـی جورمی "حەقیقی"

بۆکان ـ ١٣٦٤ی هەتاوی

● ئیشارە بەم شیعرەی سەعدی یە :
اگر یک سر موی برتر پرم فروغ تجلی بسوزد پـــــرم

خودایا خەلق و ئەمری تۆ هەوانین
لە خەلقی کاینا تتدا خەتا نین
قەدیم و باقییە زات و سیفاتت
هەی و بووی و دەبی بۆ تۆ فەنانین
زەمین و ئاسمان و مانگ و رۆژت
ریاز و راز و رەمزی بێ بەها نین
لە رێی ناسینی تۆ وەستان لە رێوە
ئەگەرچی هەردوو وەستان عەقڵ و زانین
سەنا مەخسووسی تۆیە وحەمدی بێ حەد
کەسی دی لایقی حەمد وسەنا نین
هەور لەو رۆژەوە فەرمووت بباره
هەتا رۆژی حەشر دایداتە بارین
ئەوەندەی بەفر و باران دێنە خوارێ
ئەوەندەی چۆم و چاوە وجۆگە جارین
هەموو بەحر، ئایەتن ئەمما بە ئایەت
ئەوەندەی هەن ئەوەندەش بێنە یارین
ئەگەر دونیا هەموو تۆفانی نووحە
چەم و بەحر و کەرێز وبیروکانین
مورەککەب بن بنووسن گەورەیی تۆ
لە ئەنتدا بە قەدری پووشی کانین
بەشی رامان و دامانن لە نەخشت
ئەگەر زەڕراتی عالەم پاکی مانین
شەریکت نین و پێویستی کەلەک نی
لەبۆ ملکت سنوور و ئینتیها نین
دەڵێن حوسنی تەبیعەت سەربە خۆیە
بە ماهیەت ئەوانەی شارەزا نین
لە بەفرانبار و رێبەندانی ئەوساڵ
نیشانتدا خودا ناسی و خودا دین

دەی و بەهمەن کە وێنەی زەمهەریرن
بە دەستی قودرەتی تۆ بوونە هاوین
لە کوێستان تەبری گەرمێنی نەچۆوە
کەدی گەرمێن وکوێستان لێک جیا نین
دەمی حوکمت لەباتی ڕنووە بەفران
ڕووانەدی نەرگس و لالە و ڕیاحین
چەلان قەندیل مەلای مەندیل بەسەر بوو
ئەوێستا شێخی سەر سەوزە وکەوا شین
سەری بە گوڵاڵە دەدرەوشێ وەکوو تاج
هەوراچی تەختە جێی وەک شان وشانین
هەڵاڵە و سوێسنە راوەستاوە سەف سەف
لە شان وباسکی چەشنی فەوج وتابین
فەرش هەن رایەڵ و پۆ زێڕ و زیوون
بە نەخشە و وێنەکەی باغ وچیا نین
لەخەیری و خەتمییە تاری کەش و تووش
گوڵی شەوبۆیە پۆی، هەڵز وکەما نین
نە شانەی دی نە خم ئەو رەنگ و ریسە
بە ئەمرت سوور و شین و ئاڵ و ئاوین
گوڵی زالەن نە چەتری تاوسی مەست
گوڵ ئەستێرەی شەوانن شەوچرا نین
بە رەنگی سوورەتی و زەرد وسپی وسوور
شکۆفان بوونە گوڵ بولبول مونادین
دەمی پشکووتنی خونچەی بەیانان
نەسیم ئامادە بۆ عەنبەر فشانین
دەرو دەشت و چیا خەملی وەکوو بووک
هەوا زاواء گوڵاوو عەترە کابین
نموونەی پێکەنینی گوڵ بە شەونم
گرینی بولبول و خەندەی بەیانین

بە عەتری مێخەکی وسووسەنەر و باس
کە خۆشبۆتر لەوان میشکی خەتا نین
کەژوکێومەست وبولبول مەست وگوڵ مەست
دەڵێی ئەو دەشتە هوشیاری تیانین
خەتایە نیسەتی بۆنی هەڵاڵان
لەگەڵ میشکی خوتەن چین وخەتا چین
لە تەفسیری شیرەمدا مووشکافان
بە فەسلێوا خەریکی مووشکافین
لە شیوان قاسپە قاسپی خاسەکەودێ
لەسەر شیوان چریکەی باز و شاهین
دەمی سوبح و مەسا قازو قورینگان
بە ڕێزە و سەف چەپ وراست و موساوین
لە دەم چۆمان قولاغەی داوە ماسی
بە سێلاوی خڕاوان جۆگە ماسین
لە چۆمان و لە گۆمان قەڵپەزەی ئاو
لە هەڵفڕ هەڵفڕی قاز و مراوین
خەزاڵان کاتی تێبەردان و هاوێر
لە نەخشی بێریا حۆری وەهانین
بەدینی دەس لەنێو دەس نانی چۆپی
سەماچی حەوتەوانەی ئاسمانین
لەگەڵ ڕەنگین کەوانی لێت نەگۆڕێ
کەوای ڕەنگینی وان ڕەنگین کەوانین
وەکوو ئەستێرە دەدرەوشن مەداری
لە ئەستێرەی مەداری ئوستووانین
هەوا تاریک و روونی پەرچەم وروون
قەمەر کەوتۆتە عەقرەب بۆ رووانین
بە چاوی موشتەری بڕوانە زوهرە
ئیشاراتی عوتارید ناڕەوا نین

لەسەر سەریان دەسوورێن پۆلی کۆتر
دەڵێن ئێمەش بەلاگەردانی وانین
کەوی دڵ سەیدی چاوی بازی نازە
لە حوکمی چاوی بازان کەو رەهانین
چ شیرین گزەی جەرگ و بزەی لێو
لە لایەک خەندە بۆ لای دیکە ناڵین
گوڵان حەرمانی گوڵیان سوورە ئەمما
بە فکری موستەحەق و بێنەوا نین
سەنەی ئەوساڵە تایبەتیەی بەشەمسی
دەنووسم بۆ ئەوانەی نەسلی سا نین
هەزار و سێ سەد و پەنجا و شەش بوو
لە حەفتا تێپەڕی بوو عومری فانین
لەبەر دەردی گوناهان دڵ نەخۆشە
حەکیم ئامان چ دەردان بێ دەوا نین
گەدایێکم لەبەر دەرکی خودایەک
"فلاتنهر" کە غەیری تۆ خودا نین
بەهۆی "لا تقنطو من رحمت اللـه"
دڵم خوشە کە وەعدەت بێ وەفا نین
بە "سبحان الذی اسرا بعبده"
بە شای مەسنەدنشین و ماسیوا بین
بە نووری سەیدی سەردار و سەروەر
کە ئەلقابی ئەون "طه ویاسین"
موحەممەد ئەشرەفی ئەولادی ئادەم
کە لەو چاتر لە لای تۆ ئەنبیا نین
ئەوی ئەسرایە دی و بیستی و گەڕاوە
بە گشتی هەرچی ئەسرار و مەعانین
بە ئیخلاسی رەسووڵانی ئولولعەزم
بەوانەی وا خوداناسان و نامین

پەشیمانم لە تاوانم سپووره
پەنام هێناوە غەیری تۆ پەنانین
لەگەڵ بەحری کەرەم ناجۆرە نارت
بە کوردی شاوو شاور ئاشنا نین
بنێره و بیکە دەرمانی "حەقیقی"
شنەی رەحمەتکە لەو چاتر شفانین
سیراتی موستەقیمم بۆ کەرەمکەی
نەسیبم کەی سەفی ئەنعەمتە شامین

سەنا بۆ "اللە" خودای میهرەبان
لەدین ودنیا رەحیم و رەحمان
لە حاندی حەمدی زمانم لاڵە
باقی هەر ئەوەو باقی بەتاڵە
خوای سەما و زەوی بەرزو نەوی یە
ئەدیوو دیمەن پاکی ئی وی یە
فەلەک و مەلەک، مانگ و رۆژو شەو
مەخلووقاتی دی کێ خولقاندی ئەو
هەور و بارانە ، ئاوو خاک و با
چۆن خەلق دەبوون ئەمری ئەو نەبا
لە خەلقی ئادەم عەقڵ دامـاوە
ئەندێشە ماندوو، فیکر وەستاوە
دوو چاوو دوو گوێ،دوودەست ودوو پێ
بەبێ تەفاوەت ،کێ وەک کێ دەچێ
بەشکڵ ودەنگ ورەنگ وخولق و خوو
کێت دی وەکوو یەک،کێت دی وەکێ چوو
بەشەو دیمەنی مانگ و ئەستێرە
بەعەرزو توولی کانی و ئەستێرە
کانی بچووکە ئەگەر دەریایە
قیاسی ئەویش وەکوو ئەم وایە
بەلام دەبینی ئەرزو ئاسمان
دەشتەپانەکان، کێوەبەرزەکان
هەرچی مەوجوودی دیارە لێتەوە
لەنیسکی چاودا جێی دەبێتەوە
شوکرانەی باری قەت نابێ تەواو
ئەواوێ بگرە بە فرمێسکی چاو
فەسڵی بەهارێ باغان دەکا خۆش
گوڵت دەداتێ بە باوەش و کۆش

کارگ، کوڕادە، کەنگر و ڕێواس
قەیسی، بەلاڵووک، هەڵووچە، گێلاس

دارودەوەن و چڕو کەز و کێو
بووکی رازاوەن، بزە لەسەر لێو

خونچە دەکاتە نەشە و گەشە و گوڵ
بولبول دەکاتە دلێک و سەد کوڵ

شەماڵ ساف دەکا هەوای دەرەوە
کانی روون دەکا، ئاو روون کەرەوە

هاوینێ دێنێ دوای فەسڵی بەهار
پڕن لە نیعمەت دەشت و زەوی وزار

هەرچی پێت بوێ خوا پێتی داوە
دێنە بەردەستت لەو خاک و ئاوە

نایەتە ئەژمار ئەو خێرو بێرە
نەخۆماندوو کە نەبی ئەژمێرە

لێشاوی نیعمەت نە سەرە و نە بن
چی نەفست بیوێ و "تلذالاعین"

پاییزێ حاسڵ هەمووی دەگاتێ
زەکات یەکێکە لە واجباتێ

بیدە و خەرجی کە وپێی بچۆ مەکە
ئەگەر هاتیەوە خراپەی مەکە

هەر لەبەر خودای بچۆ زیارەت
دەخیل سەد دەخیل نەکەی تجارەت

لێت پووچەڵ دەبێ وەک بنێشتی جوو
تەماشا دەکەی دین و دنیات چوو

ئەوجار زستان دێ دوای فەسڵی پاییز
سەرما و کرێوە وبا، بە ویزە ویز

دەکورسی بخزێ هەتا نەوروزێ
سەفەران مەکە، لێ مەدە پۆزێ

لە چەقەخانان درۆ بە تێرە
گوێی بۆشل مەکە، نوێژان وەگیرە
ئەگەر ئازا بی هەڵی شەو نوێژە
لەدەستی مەدە شەوگار درێژە

بۆکان– ١٣٦١ی هەتاوی

سەحەر لەتەرفی بۆستان لەسەحنی لالـەزارەوە
نەسیمی جانفزا وەزی بەموژدەیی بەهـارەوە
زەوی زومورڕودی بووە بە فەرشی زەرنیگارەوە
وەکوو دوڕ و عەقیق ئەچن شکۆفەکان بەدارەوە
ئەوا دەچێتە گوڵ چنین گوڵێ بەلەنج و لارەوە
نیگاری ماهروویی من بەشەو دەمێ کە دێتە دەر
لەدەوری کولمەپەرچەمی دەڵێی لەعەقرەبا قەمەر
لەبۆنی میشک وعەنبەری جیهان بەهەشتەسەربەسەر
دەمی مەسیحە وا کەدێ لەبەر دەمم دەمی سەحەر
وەیا شەمیمی میشک بۆ لە نافەیی تەتارەوە
شکوفتە بوون گوڵ وسەمەن بەئەمری"حی ذوالمنن"
یەکێ عەرەق بە کولمەوە وەکوو نیگاری سیمتەن
یەکێ شنەی موعەتتەری میسالی عەتری یاسەمەن
بەبێ قیامەت ئەو دووە دەکەن قیامی تەن بەتەن
لەسەحنی گوڵشەن و چەمەن لە لێوی جۆیبارەوە
عەرووسی مانگی بانەمەڕ وەدەرکەوت وەکوو پەری
بە عیشوە وبەنازەوە بەخشڵ و زێڕو زیوەری
چیا وەکوو بەهەشت ئەچێ لەبۆنی میشک وعەنبەری
لە قەهقەهی کەوی دەری کە دێنەدەر لەدوو دەری
چ زوهرە بێ چ موشتەری دەکەونە ئیزتیرارەوە
نەمامی داری سەروە یاقەدی نەمامی دڵبەرە
شەمیمی عەتری یاسە یا بخووری عوود و عەنبەرە
لەبۆنی یاس و یاسەمەن چڕو چیا موعەتتەرە
دەمێ بەداری سێوەوە شکۆفە میشکی ئەزفەرە
دەمێ عەقیقی خالیسە بەدەم لقی هەنارەوە
فرێدە غەم کە مووسمی نیشات وشادییە و سروور
دوبارەغەملێ کێووکەژبەرەنگی زەردوسەوزو سوور

بەرەغمی شاهویی خوتەن هەلاڵە بۆنی دێ لە دوور
گوڵ ئاتەشی بەرەنگی سوورەکوو قەبەسلەکێوی توور
بەسانی خشڵی کێوی نوور بەسینەیی نیگارەوە
دەڵێن لەپەردەیی خەفا ئیرەم چەلێکی هاتەدەر
بە سەد هەزار رەنگ وبۆ بەزیوەری دوڕو گوهەر
وەلێ گوڵی بەهاری من وەرای تەسەووری بەشەر
دەسی مەشاتەیی قەدەر کراسی نازی کردە بەر
کلاوی زێڕی نایە سەر بەتۆق و گۆشوارەوە
گەلی کچانی چاوبەکل فریشتەکانی شاوو گوڵ
دەمێ کە دەچنە گوڵ چنین بەعەینی هی خەزاڵی سل
دەسێ لەگوڵ دەدەن دەمێ،دەمێکی پەنجەیێ لەدڵ
هەلالەکان چەپک چەپک دەبەن وەنەوشە چڵ بە چڵ
بەری بەیان وتاوپەڕان بەبەرقەدو نسارەوە
نە هەرلەخەڵوەتا بەشەو خەریکی زیکرە مورغی حەق
نە ئینس وجنن وجانەوەرنەهەرمەلەک تەبەق تەبەق
وەرە ببینە بێ خەبەر دەمێ بەیان ئەدا شەبەق
چیا ،چەمەن،گوڵ وسەمەن،گەلاگەلا، وەرەق وەرەق
بەیانی کیبریایی حەق بەکێوو چێوو دارەوە
بەشەو کەدەنگ ئەداتەوە لەکێوی قاسپەقاسپی کەو
تروسکەیێ بەگوڵ دەدا نەسیم ونووری مانگە شەو
من ونیگاری نازەنین بەمەزهەبم حەرامە خەو
دەمێ نیازورازی من دەمێکی غەمز ونازی ئەو
"حەقیقی" فرسەتی وەها قسەی دڵت مەشارەوە

" گوندی قەرەداغ ،ناوچەی مەهاباد
بەهاری ١٣٠٠ی هەتاوی"

چزەی برزانی جەرگم بوونە سۆسۆ
قەڵای بەفری سپی کردن قەڵاچۆ
نەیارێکی دژە زستانی نامۆ
شوکر دەرچوو لەناخی دڵ کوڵ و کۆ
ئەوا بای وەعدە هێنای بۆنی شەوسۆ

بەهارەوسەردەمی سەیران وگەشتە
دەرودەشت و چیا وێنەی بەهەشتە
لە بزوێنی زەمەندی کێو و دەشتە
تەبەق جاران حەوت بوو ئێستە هەشتە
زەوی هەروا لەشکدا هەشتە یا نۆ

پەلەی هەوران کران دیسان حەواڵە
لە کێوان گرمە گرم و ناڵە ناڵە
لە حاندی بۆنی بەیبوون و هەڵاڵە
عەبیر و میشکی چین مەشکەی هەڵاڵە
لە مەولا عەتری قەمسەر کەم دەکەن بۆ

لەنێو باغی گوڵان شەونم دەبارێ
سەفا دێ خەو دەتۆرێ خەم دەتارێ
لە رازان قاز و قومری دێنە خوارێ
قەلی رووڕەش بلێ با خۆی وەشارێ
لە بەر چنگ و پلی بازان و شاهۆ

ئەگەر بەرز و نەوی دیوە و نەدیوە
ئیرەم دیو دیمەنی ئاوای نەدیوە
رەقیبی کاخ و قەسران کۆخ و دیوە
نموونەی جەننەتی کەیوان خەدیوە
هومای ئەندێشە ماون دەستەوئەژنۆ

لەدەشت و چیمەن و یالْ وقەدوشان
سەف ئارایی دەکەن پۆلی وەنەوشان
شلێرو سوێسنە هەم سولْتان وهەم شان
رەفیقان خەو بەسە وەختی تەماشان
بەیان بەربوو گزنگی دا لە ئاسۆ
لەسەر سینەی چیا لێزگەی گولْی یاس
بە عەینی خشلْ و گەردنبەندی ئەلْماس
گولْ و بولبول لەگەلْ یەک لێ دەدەن لاس
دەخوێنن.ان یکاد. و سوورەیی.ناس.
هەتا دوور بن لەچاوی پیس وشانۆ
شەوی مەهتابە شەونم شوعلە رادێر
دوری وردن پرپشکی ئاوی هەلْدێر
رەفیق و هەمدەمم لەودەشتی زەنوێر
حیکایەت خوانی مەولانایە بلوێر
کەوی کێوی دەفە و چەنگەوپیانۆ
گزنگ ئەنگووت و گولْ پشکووت و باری
لەسەر فەرشی زومورڕود رەنگی باری
بەهارا ئەی بووکی بێ وێنەی لەباری
قەتاری بارەشایی زێڕە باری
کەمە بۆ زێروەشان سەرباشە کۆکۆ
بەیاری رۆژی رووت و پەرچەمی شەو
بە رۆژی روون دلْت بردم بە شەو خەو
قسەن پەیمانی ئاتلانتیک و وەرشەو
ئەوان با هەر لەفێلْێ بن لەم ولەو
ئەمن پەیمانی تۆ نادەم بە ناتۆ

بە خونچەی پێ کەنی گوڵ بۆیە سڵ بێ
نەڵێ وێنەی دەمم پەرژینی گوڵ بێ
لەدووری تۆ ئەگەر زینم بەدڵ بێ
ئەگەر دڵ غەیری تۆ بۆکەس لە کوڵ بێ
لەپێی مەحشەر وەباڵی تۆم بەئەستۆ

بەیامی‌دا جەوانێکی هەوەسباز
بە پیرێکی کەهێنابووی لە زین واز
کە تۆش بووتە وەکوو من یاری مومتاز
ئەتۆش دیوتە لەیاران عیشوەوو ناز
چ ماون خاترەی ئەودەم لە لای تۆ

ولامی داوە ئێستا هەر منالی
ئەتۆ عیشقی مەجازیت دیوە کالی
لە شێخی مەسنەوی جۆیا بە حالی
کە* دڵ بێ عیشق سندووقێکە خالی*
دڵێکی واکەتۆ نەت‌دیوە ئەوتۆ

لە شەوقی روومەتی وەک شەم دیاران
شەوارەن کەو لە کوێستان و هەواران
بەیاران بوونە باغی گوڵ بەیاران
حەقیقی تۆ بڵێی کاتی بەهاران
رەفیقانم بکەن یادێکم ئاخۆ

بۆکان - بەهاری ١٣٦٣

* ئیشارە بەم‌شیعرەی مەولەوی یە کە دەڵێ :
سینه کو خالی ز معشوق بود
سینه نبود کهنه صندوقی بود

دیسان شەی نەسیمی بەهارە و کزەی شەماڵ
دیسان بەبەرگی تازەیەوە تازە بۆوە ساڵ
تۆقی سەراوی کانی لەبەر گرمە گرمی رەعد
شین بوو زەوی بەنم‌نمی هەوری گەواڵ گەواڵ
خەملّی چیاوچەمەن بەسپی وسەوزو زەرد وسوور
دارو دەوەن بووە بەهەزار رەنگی شاڵ و واڵ
لاچوو بەحارێ پەردە لەرووی جەننەتی ئیرەم
رازاوە تاقی ئەتلەس وکیمخواوو حەریرووواڵ
کوێستان لەبۆی‌هەڵاڵە وبەیبوون عەبیری خاو
رەنگاوە باغچەکانی وەکوو بووکی چاردەساڵ
ئەشکەوت وکێووکەژ بەخڕی قاسپەقاسپی کەو
گوێ کەڕ دەبێ لەقاڕەیی قازوقورینگ و داڵ
یا بارە ساڕی بێچووە یا کارە کاڕی مەڕ
یا قارە قاڕی قومری‌یە یا هارە هاڕی باڵ
دێن ودەچن بەدوندو قەدی زەردو ماهەوە
کا کێوی تاق وجووت وبەگەل مێگەلی مەڕاڵ
پێش ئەودەمەی گزنگ لەسەران دابەری بەیان
یا ئەودەمەی کە زەردە لەکێوان دەدا بەحاڵ
بڕوانە عەینی قەوس وقەزەح دێنە بەرنەزەر
خاشخاشکی سوورو سەوزەیی سەوزی بنارو یاڵ
کیژان بەپۆل بەیانی دەمێ دەچنە گوڵچنین
وەک حۆریان دەچن هەموو لێوئاڵ وچاوکەژاڵ
قەدیان وەکوو بلوورە بڕویان وەکوو هیلال
چاویان میسالی نەرگسە مەست وخومارو کاڵ
دەم چەشنی غونچەیی گوڵەباغی بەری بەیان
روومەت دەڵێی شەهیدە لەخوێن دابووە شەلاڵ
عەینەن دەڵێی بەمێخەکی نەخشاوەسێوی سوور
وەختێ کەدێن دەبینی لەسەر کولمە وردەخاڵ

جووتەی مەمک بەراست وچەپی سینەوە دەڵێی
پەیوەندی داری عەرعەرە نارنج و پرتەقاڵ
شێوەی شەمامەیێکە دەسی وێ نەکەوتبێ
وێنێکە سێوی نۆبەرە عەکسە هەناری کاڵ
بۆباس وخواسی زەڕڕەیەک شاساری کردگار
فیکری بەشەر دەوەستێ زمانی لە وەسفی لاڵ
ئەو سوێسنە و وەنەوشە و نەسرینە بۆ چیە
ئەو رەنگ رەنگی سوور وسپی وزەردوشینوئاڵ
بۆیەن هەتا لەبیرچێ خەمی بەفری نەگبەتی
بۆیەن هەتا نەمێنێ نیشانێ لە درِک و داڵ
بۆیەت شەواوی باغی دەدا شەونمی کەرەم
تا گەش ببێتەوە گوڵی عومرت لە زینی تاڵ
هەستە لەخەو بەیانە حەقیقی زەمانی گوڵ
سەیران دەکا لەباغی گوڵان بولبولی خەیاڵ

بۆکان ١٣٢٣ی هەتاوی

خاکەلێوە سەرەتای سالی نەوم
دلرفێن دلبەرەکەی چاو بەخەوم
هاتنت هاتە لەبۆ باری ژیان
گیان لەبەر سەهلە گیا دەگرێ گیان
بەهەوای هاتنی تۆ بەیکی شەمال
پێشەکی موژدە دەبا ماڵە وماڵ
هاودەسی تۆن لەهەرەس هەورو هەتاو
تا لەجێ ماڵێ دەرێنن چالاو
زینەوە چاوە بە شەمری باری
ئاوی هەڵدێر و چەم وجۆباری
دەمی زیندووکەرەوەی بەحروبەری
قاسیدی خۆش خەبەری بانەمەری
بانەمەر دەفتەری خۆشی بەشەرە
لاپەڕەی دووهەمی ئیسنا عەشەرە
کلی چاوە گلێ دەشت و چەمەنی
جەننەتە دیمەنی دارو دەوەنی
باغ و باغات و چیا رەنگینە
کاتی خەرمانی گوڵ و نەسرینە
مەخمەری سەوزە بناری کەژو کێو
گوڵی سوورە لق و پۆپی پەل وچێو
ئەو چراخانە لە داوێنی چیا
گوڵە خاشخاشکە لەنێو سەوزەگیا
خێوەتی سوور و سپی هەڵدا باغ
گوڵ لە پشکووتنە بولبول بەدەماغ
باغ وبەر کردیە بەر خشڵ وکراس
گیان لەبەرمەستەلەبەربۆیگوڵیاس
بەر قەدی کێوی بە ئاوی هەڵدێر
پڕ گیا و سێوەڕە مەزرا زەنوێر

سوسول و سوێسە سەوزرا سەوزرا
لەسەران ولەدەران دا سەوزرا
ژالە مەی لالە پیالەی هێنا
بای شەمالێ بۆنی هەلاڵەی هێنا
کزەبا بۆنی هەلاڵان دێنی
عەتری گوڵ موفت وبەتالان دێنی
زێڕوەشانی قەدەمی سووکی گوڵە
پەڵە هەوران دڵی پڕیان لەکوڵە
دوای شەوی شەونم و ڕۆژی باران
وەرە بڕوانە دەمی ئێواران
دیمەنی قەوس وقەزەح سەربەرە ژێر
چەتری هەڵداوە دەڵێی تاوسی نێر
قەد و یاڵ وخڕو شیوو دەرو دەشت
بوونە یەک نوسخە لەباغاتی بەهەشت
نەزمارێکی هەیە نەخش و نیگار
نە حەوالەی کەرەمی دێنە ژمار
لەسەران مانگەشەوە وشیوان شەو
لە دەران یەک بەدووە قاسپەی کەو
دێ ودەچن قازو قورینگان پۆل پۆل
لە سەراوان و لەدەوری چەم و گۆل
کەیف وخۆشی و نەشەیە ورەقس وسەما
بەزم وشادی لەزەمین و لە سەما
دەشت وسەحرا بەگوڵی ئاڵ ووالێ
جێی فیکر کردنە بۆ ئەهلی حاڵ
گوڵە خاشخاشکی تەماشا کە لە دوور
خاڵی ڕەش جوانە لەسەرکوڵمەیی سوور
خونچە پشکووتووە هەر وەک دەمی یار
سێو وەکوو کوڵمە ،هەنار وەک مەمی یار

گوڵی سووروەحتێ کەدی رووومەتی سوور
عەرەقی شەرمی رژا رووبەرە زوور
شۆڕەبی پرچی پەرێشانی گرت
دی وەکوو زولفی نەچوو مانی گرت
عەرعەرو قامەت و ساڵای بەرزی
کە نەمامی قەدی تۆی دی لەرزی
نەرگس ئەو ساتە کە یاری دیوە
مەستی و چاوی خوماری دیوە
داری سەروە و بەری هێنا قەدی یار
فندق وپستە وو بادام و هەنار
دوێ شەوێ بولبولی عاشق ناڵی
حاڵییە هەر کەسێ وابێ حاڵی
بەهەوای خوێندنی سەر پەلکی گوڵ
تێ گەیشتم وتی ئەی ساحەب دڵ
گوڵە سوورێ دڵی پەڕ پەڕ کردم
بە مرادم نەگەیشتم مردم

"بۆکان – ١٣٣٥"

بەهارە و مانگی خۆشی بانەمەڕ سەیریکە بی بینە
دەرو دەشت وچیا و کێوو کەژی دنیا هەموو شینە
چیا غەملێ،گیا شین بوو، چەمەن رازاوە،گوڵ پشکووت
لەهەر لا تێ دەفکری سوێسنە و بەیبوون ونەسرینە
وەها نەخشاوە کوێستان، عەقڵی تێدا ماتوحەیرانە
بە خەتت وخاڵی ئاڵ ووالێ شان ویاڵی رەنگینە
شریقەی هەورە، گرمەی رەعدە، هاڕەی ئاوە،هاژەی با
هوجوومی لەشکری سێڵاوە، جەنگەی کانی تۆقینە
گوڵی زاڵە بەعەینی تاوسێکە چەتری هەڵداوە
سوپای لالە لەشانی کێوەکان سەرگەرمی تەمرینە
لەسەر چۆم و چیا قاز وقورینگ وقومری پۆل پۆلن
گوڵ ولالەی بناری کێووکەژتیپ تیپ وچین چینە
چەمەن فەرشێکی سەوزە نەخشەکەی لالەوگوڵ وسونبول
لە دەشتێ راخرا وەک ئەتڵەس و خارا و پەشمینە
لەپاش بارانە بڕوانە شلێرو شەشپەڕو شەوبۆ
لەوێنەی وانە وا ئەلوانە رەنگی کۆلکە زێڕینە
گوڵ ئەستێرەی شەوی نیسانە خاشخاشکی بەیانانە
تررووسکەی ئاوری شوانە لەنێو ئەو مێرگە نەخشینە
کزەی بایەک گەڵای داران دەبزوێنێ و بریقەی دێ
دەڵێی ئاهی منەو گوێی دڵبەرەوگوارەی تەلایینە
دڵۆپەی شەونمی پەلکی گوڵ و بۆنی شنەی شەوبۆ
هەناسەی ساردی فەرهادە و تکەی فرمێسکی شیرینە
عەزیزم پایزە، کاتی زەکاتە، وەختی خەرمانە
بەهاری مەیلەکەت زستانە ئەمما لێرە هاوینە
رەقیبی وردەگر بیستوومە باسی وەردی پێ وەردە !
دەڵێ ئەو شێوە شێوەی کۆنەیەو دووبارە جاوینە

بەڵێ بۆئەهلی دڵ تەوسیفی گوڵ وەک سوونەوەی میشکە
بڵێ هەر تازەیە لای بولبولان ئەو رەسم و ئایینە
"حەقیقی" ئەو بەهاری سوور و شین پەندێکە بۆئێمە
بەهاری عومری ئێمەش وا دەمێ سوورە ودەمێ شینە

بەهەشتە نیشتمان فەسلی بەهاران
لە کێوو کەژ لەنێو خێڵ و هەواران
بە بۆنەی سونبول و نەسرین وشەوبۆ
چڕ و چێوو چیا مەستن لەسەر بۆ
لەنێو باغان دەمێکی با کزەی دێ
بە شووی مووساو بەفووی عیسا بزەی دێ
دوکانی عەترە بازاڕی قوماشە
بخوازە چی دڵت گرتی بەلاشە
لە شاخ وبەندەنان هەرچی رواوە
دەڵێی بە گوڵاوێ ئاوپرژێن کراوە
وەهای لێکداوەکوێستان رەنگی ئەلوان
پیازو سیری وەک گوڵ وان لەگەڵ وان
چکۆڵە وگەورە نین لەو مێرگ وحەوشە
لەگەڵ هەوشانی هاوشانن وەنەوشە
هەموو دوو دوون گوڵی سووروسپی وئاڵ
لەدەوری ئاوەکان وەک چاوی قەرزاڵ
بە عەینی بووکی رازاوەن پەل و چێو
جلی حەورەنگیان پۆشی کەل و کێو
بەزەینی من لەشەرمی نەخشی جوانی
نەمانی چاترە "مانی" لە مانی
پڕی چێو وچڕی دەنگی کەوانە
لەگوێن رەنگی کەون رەنگین کەوانە
لە لایەک زاوو ماکە ولایە هاوێر
لە لایەک هاڕەهاڕی ئاوی هەڵدێر
بەشەو رامێنەئەستێر وشەتاوان
جموجۆڵیانە ئەستێران لەتاوان
دەڵێن داخۆ چ قەوماوە لە ئەرزێ
نەهاتوو زەلزەلەی ساعەت ئەلەرزێ

فەسڵی بەهارە شینن کەژ و کێــو
سوورن گوڵاڵان سەوزن پەل و چێــو
جوانی تەبیعەت باغ ودەرو دەشت
پێشانت دەدا مەستوورەی بەهەشت
خوناوکە باری،چیمەن ئاو درا
چڵێ گوڵی سوور بوو بە چلچــرا
گوڵی سوور کردن بولبولی ناڵاند
نەمری تەبیعەت ،جولی لێک هاڵاند
گوڵان پشکووتن لە شاخ و داخــان
خۆش بێ نیشتمان بۆتە چراخــان
دەشت وتەلانی وەک عاسمانی شیــن
باغی گوڵانی دەم بە پێ کەنیــن
گوڵ بووک وبولبول ،زاواوباڵداران
لەسەیرو سەمان سوبح وئێــواران
تەرازووی خەیاڵ دەکاسەنگ وسووک
بۆ زێڕوەشانی شانی زاواو بووک
دەنگی قەلّپەزەی ئاوی هەڵدێــرە
تووڕەی توزەلە ودەنگی بلوێــرە
بەهار جامێکی جیهان نومــایــە
نانا نموونەی بەهەشتی خوایــە

بۆکان ـ بەهاری ٦٥

هاوین ! گەرمی تۆ گەرمی ئەوینە
دووری بەهارە ئەو تاو و تینە
سێوت دەگاتێ وێنەی مەمی یار
بادام لەدووی ئەو چەشنی چەمی یار
بی مەجنوون گەرچی پەخشانە
وەک زولفی لەیلم نەکراوە شانە
بەلام سەروی ناز لە دەم جۆباران
تەنیا وێنێکە لە بالای یاران
بۆ تێدار چاکە سایەی داری بی
ئەمما ئەویندار سایەی یاری بی !
ئەسکەندەر تینووی ئاوی حەیاتە
حەیات ئەوکاتە دڵ وا لە لاتە
لەرزی دووری یار زۆر دڵ تەزێنە
تینی ئەوینی ئاور بەزێنە !
بڵێسەی گەرمات میوەی گەیاندێ
یەکیان دەگاتێ نۆبەی دەیان دێ
میوەی فەسڵی تۆ وا شاد و شیرین
دێنێتە بیرم فەرهادو شیرین !
لە گەرمی تۆیە تینی ئەوینم
لە تۆڕا پێک دێ ئاواتی ژینم

"سەقز- پووشپەری ١٣٦٥"

ئێستا دەست دەکەم بە نووسین
چونکە بانگی ساقی بوو

نکە یادێکی لە رابردوومان
لە غەریبی و لە رەفیقی زوومان

دۆستی حاران و خەرِ و شێوانم
حورمەتم فەرِزە ئەمن مێوانم

هەڵبڕاوم لە گەل و قەوم و کەس
هیچ لەبیرم نەبوو لێ قەومان هەس

وتی نەت بیستووە کاتی قەومان
لە ژەهر تاڵترە شەکری قەومان؟

رۆژی تەنگانە رەفاقەت بایە
چونکە قانوونی تەبیعەت وایە

دەمی خەم تاڵە لەدەم نوقل و نەبات
دۆستی بایە برا ، کاتی نەهات

وەختی بەدبەختی برا دوژمنتە
رۆژی رەش دوژمنی ماڵی ژنتە

شێت و نادانی ئەگەر لوقمانی
قسە نازانی ئەگەر سوحبانی

ئەو وڵامی ئەمی وا داوە بەداخ
ئەم لە ئاخی دڵی هەڵکێشا ئاخ

ئەو کەمێ داخی دڵی بوو خاڵی
ئەم بەجوابی رەق و تاڵی ناڵی

گیان گەلێ سەختە دەنا دەیزانی
ژانە ئەو ژینە نەمانە مانی

بەدەژان چوونی دەم و گوێ و دەس و پەل
تێگەیی رۆژی ئەجەل گەیوەتە کەل

کاتێ پەیدا بوو نیشانەی مەرگی
ئاخی مەرِ ئاوری بەردا جەرگی

نەشتەری تیژی هەناسەی مەڕی پیر
دڵی بزنی لەرِی پێکا وەک تیر

دی رەفیقی لە هیلاکەتدایە
بێ کەس و بێ دەرو بێ ئەنوایە
وتی ئەی هاودەمی نەرم ونۆڵم
ئەی رەفیقی خڕ و شیوو دۆڵم
جێژنەپیرۆزە لەگەڵ هاومالآن
شادییە، شینی لەگەڵ ئاوالآن
هەیە لای پێشەوە جێی سینگ وسەرێ
بێتە زوور نیوەت ونیوەش لە دەرێ
پەزی کز لارەمل و بێ دەسەلآت
وتی "لبیک" بە ئومێدی نەجات
مایەوە یەک دووشەوێ ماوو نەماو
تا ئەوی سایەقەیەکی لە نەکاو
گورگە هات و پڕی دایە و بردی
ئەوە بوو نەقڵی منالێ کوردی
دووگەکەی لێ بووە کوڵی چەرچی
کەوڵەکەی لێ بووە کەوڵی قەرەچی
لەت وپەت بوو لەشی نەرم و لووسی
تکە تکە خوێن دەڕژا و دەینووسی
ئەی بزن سادە بزی بۆ ورگی
وەکوومن خۆ مەکە پارووی گورگی
ئەو بەسەرهاتە " حەقیقی" پەندە
بۆ کەسێ عاقڵ و زیر و مەندە
شایەتی تەختی سولەیمان بایە
خاوەنی مڵکی قەناعەت شایە
کەم بە خەم زۆر نەبووە کاتی ژیان
بەش کراوە لە ئەزەل بەرگ و نان
عەیری دەرکێ مەدە تا هەی لەچەدەر
تەک وتەنیایە خودای رۆژی دەر

قافڵەی نیعمەتی رەنگا رەنگی
بێ منەت دێنیە دەنگ و زەنگی
پاک و پێک هێنی نیازەو بەخەبەر
لە چەرەندە و لەپەرەندەولەبەشەر
گیان لەبەرهەرچیلەسەررووی زەوی یە
سەرلەبەر جیرەبەری خوانی وی یە
بە زمان ودڵ و گیان ودەس و پێ
قەدری ئەنعامی خودا نایەتە جێ
نازمێرێ بە زمان وزاری
شوکری ئیحسان و سوپاسی باری
تۆ کە نەیگۆڕی خودا نایگۆڕێ
عاقیبەت خێر ئەوەیە نایدۆڕێ
تۆوە ئاکار و ژیان شێوەردە
سوورە خەرمانی کەسێکی مەردە
کەم و هەوراز و نەشێوە ژینت
مەکە سەودایە بە دنیا، دینت
یاری ناسینی خودا " اولی"یە
ماڵی تۆئێرەنیە ئەولایە

سوپاس هەر بۆ خوای تووانا و زانا
ئەو خوایەی ئەرزو ئاسمانی دانا
لە رۆژی خیلقەت تا رۆژی مەحشەر
تا ئەودەمەی سەر لە خاک دێنە دەر
هەموو پەڕی گوڵ هەموو گەڵای دار
هەر گەڵا و گوڵێ ببنە سەد هەزار
هەموو زمان بن هەموو زەمانێ
تا ئاخر زەمان نەوەستن ئانێ
هەموو سەناخوان هەموو بوێژ بن
هەموو خەریکی تەحیات ونوێژ بن
لە حاندی حەمدی سیفاتی باری
شایانی قەدری پەروەردگاری
دەنگی هەرزنە و زەمین و ئاسمان
قەترە و دەریایە و ئاسمان و ریسمان
بێ وێنە و هاوتا واحیدە و ئەحەد
هەر بووە و دەبێ ئەزەلە و ئەبەد
تاک و تەنیایە و کەسی هەموو کەس
سوورەی ئیخلاسی نموونەیە و بەس
لەهەوا ، لەکێو ، لە دەشت و دەریا
ئەو پێ رادەگا ،ئەو رۆژی دەدا
ساڵێ چوار فەسڵان دێنێ و دەگۆڕێ
هەزاران نیعمەت دێنێتە گۆڕێ
جارێک پایزێ دەکاتە زستان
زستان دەکاتە باغ و گوڵستان
دەخەو دەمێنن چلەی ناهەموار
لە خەو هەڵدەستێ ساڵی دووبەهار
بچۆ تەماشای باغات و دەشتێ
هەتا ببینی وێنەی بەهەشتێ

خونچەی بەل و جێو بزەی لەسەر لێو
کەوای سەوزپۆشتەل و کەل و کێو
بەرەوبرت دێن شاران و ئەیار
ساخۆشی دەڕۆن دەگەڵ سەفەری پار
جارێک بە ئەمری حەیی زولمەنن
مانگی ئەسفەندێ دەبێتە بەهمەن
هەرەس سەسارێ دەبێتە سەنگەر
دوو چلە هێرش دەبەن بۆ ئەوسەر
ساڵێکی ئەوتۆ گەیبە ئەودەمە
سوو بە زەمهەریر مانگی رەشەمە
بەردە لەعەجووزی هێنا بۆ سەرد
کەژ و کێو و هەرد گشتی بوونە سەرد
فەرشی زومورڕود رەنگی لە دەسدا
سەرما و شەختەوبەند هالاوی هەسدا
بولبول دەناڵێ بە سەد کوڵ وخۆش
بۆ بووکی پەردەی گوڵی کەفەن پۆش
ساڵێکی ئاوا پیاوێکی فەقیر
دنیادیدە وپیر بەتەجرەبە و زیر
بۆ نان و ئاوێ لەو خاک و ئاوە
ماسی دەگرت و تەپکەی دەناوە
داوێک لەنێو ئاو داوێک لە دەشتێ
تاوێک لەنێو چەم تاوێک لە دەشتێ
دەعبای دەگرتن جارێ بیست و سێ
جوڕە و قازوو سی بەجەللە ماسی
رۆژێ دەستێکی دەبردە شاری
دەستی بە حەستەم دەگەییە زاری
دەیدا بە رزق و بە نان و پێخۆر
شوکرانە بژێر بە کەم و بە زۆر
تەپکەی نابۆوە رۆژێ لەو دەورە
دیتی فەقێیەک خەریکی دەورە

لە دەنگە دەنگی هەی ئالێ باسا
فرسەخ تا فرسەخ نەمابوو دەعبا
بەهۆی هاتوچۆی نەمامی لاوێن
ببوون بە داوەڵ سۆرانی و داوێن
جۆ پێش و پێی گوت مەلا بە دینت
چوونە: کێوی قاف مەلان بە دینت
پۆلی باڵندان تۆیان دی شێوان
تاری دەستی تۆن لە دەشت و کێوان
ئەی خۆ بە زۆرزان منت لە لا با
دەبا عەدالەت لە لای مەلا با
فەقێ نی مەلای، مەلانی قازی
تۆ بی لە جێی من بەمئیشە رازی
ساحەب خێزانم مندالم برسین
بترسی باشە لە رۆژی پرسین
ساتێ لانەچی و نەفەرمووی سکووت
پێم پەیدا نابێ قووتی لایەموت
وەڵامی داوە یا ئەخولمومن
تەقیلە چلکن برای دینی من
پەستەک نەباتی پێلاو رەشۆکی
تۆش بێ خەتانی گەلێک بەکۆکی
پاساری شاخی لە تۆ بەداخن
لە کۆخە کۆخت پەرپوەی شاخن
زەمینی ئەڵڵا وەسیع و پانە
تەپکەت راگوێزە و مەگرە بەهانە
دەنا تۆ لەولا ئەمن لەو لایە
بۆ تۆ مەسلەحەت بۆ من ئەولایە
من خۆ ساز دەکەم بۆ ئیمتیحانێ
دەبێ حیفز کەم مانای قورعانێ
دەبێ عیلمەکان هەموو لەبەر کەم
لە ئەمری شەرعی خەڵک خەبەر کەم

ئاگادار بکەم لە دین نائاگا
ڕێ لێ شێواوان بێنمە سەر ڕێگا
لێیان حالی بێ ئیرس و بەشە ماڵ
بزانن کامەن حەرام وحەلاڵ
شەوی نەورۆزێ ئاخر ساڵمە
شەرع نەزانم ، شەیتان زاڵمە
لێم تێکەڵ دەکا حەلاڵ و حەرام
ڕێم لێ ون دەکا دەکا بە مەرام
زانین بەرهەمی گەرما و سەرمایە
بێ زەحمەت نابێ مایە وسەرمایە
ببوو بە ویردم لە دەشت و گەشتێ
راتبەی فەقێیان بچنە بەهەشتێ
مۆڵەت دەخوازی شەرعەن جایزە
نە جایزێکی بەبێ جایزە
یەقین بیستووتە و دڵت نائێشێ
نەقڵی قشقەڕە و پشتی گامێشێ
هەرچی پێوەبێ دەبێ بەشم دەی
عەزم جەزم کە خێرابە زوو دەی
پاری،قاژوو،یا کۆتر یا کەو
بەشێک و دوو بەش من لێی دەخەم دەو
کەمی بەشی من زۆری بەشی تۆ
لە نۆ باڵندان سێی من شەشی تۆ
هەی ئالێ بابە هەی ئالێ بابە
ڕێگایە مەگرە تەپکەت وەلا بە
کوتی مامۆستای لەسەر ئیجازە
با بۆت وەگێڕم نەقڵێکی تازە
ئەوساڵ فەقێیەک ئیجازەی وەرگرت
چۆ کوێرە دێیەک لەوێ رایان گرت

خەڵکی ئاوایی دابانێ بۆ دۆ
شەش سەن و ماڵێن دەسووتکەم وجۆ
ماڵی مەلا هات دوو سیپاڵی سوو
بەڕە کۆنێکی سەر هەرزاڵی سوو
مەلایەتی وا بە نەمر نەزی
بەخوا من ئێژم قەرانێک ئەزی
بە تەکبیری من یەک و دوو مەکە
بە ئاڵێ بابا خۆ ماندوو مەکە
زەوێک بسێنە ببە جووت بەندە
عەبدی خودابە، نە عەبدی بەندە
نانی پەیدا کە بەهۆی کشت وکاڵ
پاتاڵ رابگرە با نەڵێن پاتاڵ
لە دێش وەڕەز بووی ماڵت بچتە شار
ببە بە تاجر وەخڕکە دینار
حەجی پێ بکە زەکاتی لێدە
لە رێی خودا دا هەر ئەو هومێدە
وەباڵی خەڵکی مەهێنە ئەستۆ
نەکەی پێت بڵێن ئەمان لەدەس تۆ
منیش خەتامە تۆ ناکەم لۆمە
زۆر موستەحەققم گوناهی خۆمە
بێ تۆڵە نابن فێڵی من و تۆ
گەنم لە گەنم دەڕوێ جۆ لە جۆ
داوم نابۆوە حاسڵ بە تۆوە
واخۆم پێوە بووم بە داوی تۆوە
کاتی گوفتوگۆی عەمامە و ریشوو
ئێستا ئاڵەکۆک نەی کردبوو شوو
لەو کێشە دابوون دایدا کرپێوە
بوو بە تەپ و تۆز لەو دەشت وکێوە

سەرما وسابەقەکەی کەم ئێسەی کەم
تەزی دەزان جوو قاچ و قول و دەم
دۆستت نەبینی بۆران و بارن
زریان و بارن سەردی دەهارن
مەرگی بە چاو دی کاتێ بەرمەلا
بە ناعیلاجی هەرای کرد مەلا!
ئەوا من ئەمرم لێرەم بنێژە
هەر کەس لێی پرسی کێیە بێی بێژە
خێوی ئەم گۆڕە پیاوێ فەقیرە
شەهیدی رێگای نان و پەسیرە
تەلقینم دەکەی بە کوردی بیکە
لێت حالّی نابم زمانی دیکە
ئەمیان کەسیرەی دەس بەفر وابوو
ئەویان خەریکی ئالێ نابا بوو
قاچ و قول و دەم هی ئەم تەزی بوو
غوولی تەبیعەت بۆ ئەو بەزی بوو
تێی فکری نەخێر چارەی تەسلیمە
مەلا گوێ نادا بە نیمە نیمە
ئەوجار بانگی کرد بەتەقیەو پارێز
عەرزێکم هەیە ماموستای بەرێز
دەڵێی چی؟ دەڵێم حوکمی خودایە
ئەگەر قەزا هات عیلاجی نایە
ئێستا کە ناڕۆی ئیلان و بیلا
بەش بەو کلابە ئەلحوکمولیلا
سولحی لەگەڵ کرد مەلا سەرئەنجام
گوتی " الطلح سید الا حکام"
با مۆڵەتی دەم خێرم دەگاتێ
بەزەیی پێ هات بزەی دەهاتێ

مەلا کلاوو بۆ دیوی نەدیو
کابرا داخرا بۆ لای خڕو شو
مەلا وێوە چوو مەلان پێوە بوون
دە پازدە بیستێک بەیەک کەلەکەوون
دانە ئاشکرا دانەر نەدیوە
دەعبا چووزانێ تەپکە فریوە
لە تەپکەی داریین پۆلێک داوەریین
دەتکوت داوەریو لەبۆ داوەریین
حەشری نیشان دا ئەو داوەرینە
تێ فکرە مەحشەر چەندێ بەرینە
بوو بە جیکە جیک بەفیکەونیشتن
بە هەڵفڕ هەڵفڕ خۆ هەڵاویشتن
لە قاژو قیژان لە پەلە قاژان
دەنووک داچەقان دڵان دەهاژان
بە جیکە وفیکە و گمە و گالە گاڵ
دەپاڕانەوە بە زمانی حاڵ
یەکیان دەیگوت من جووتەی شێلاقەم
بەهارێ دایکەی چەند سوورە ساقەم
دەزرینگێتەوە گوێچکەی خەیاڵم
بە جووکەی جووچکەی بێ پەڕو باڵم
لێم خڕ دەبنەوە بێچوولەی خڕخڕ
بۆیان دێنمەوە جیکڵدانەی پڕ
یەکیان دەهاژا لەبەر چڵی دڵ
یەکیان دەسووتا دڵی وەکوو کڵ
یەک خەونی دیبوو لێی رووخا لانە
یەک دەیگوت ئەورۆ ئاخر زەمانە
دوویان زاواوبووک دوویان جیران بوون
دوانی جوانی دی بەدەسگیران بوون

دەستە و داوێن سوون بەچنگ ودەسووک
حووتەی دەسگیران ،جیران ،زاوا و سووک
سافی لە حەسرەت گەشتی بەهاری
فرمێسکی خوێنیان لەچاو دەساری
بە داوی ئەجەل پێیان لەبەس چوو
هیوا وئاواتیان هەموو لەدەس چوو
پیر وپیاوچاکان گوێیان لێ بوو بوو
دەنگێکی غەیبی ئاوای فەرموو بوو
بیهێنە بەرچاو جەنابی مەلا
رەحمەت بنێرە بۆ ئەبولعەلا
با حەڵاڵیش بێ گوشتی باڵندە
چاو چەندە گەندە ئەو فێڵ و فەندە
ویژدان بڕوانە ئەو فریودانە
خۆ دان نەچوو بۆ نێو جیکڵدانە
ئەو موستەحەققەی مشت و ددانێ
بۆ مشتە دانێ ئەو دەردەی دانێ
تۆڵەی باوکی سەند بەچکەی بەنیادەم
گەرچی خواردی ئەو ئەمما نەیخوارد ئەم
زۆر دڵ تەزێن بوو تەپکەنانەوە
بێچوو دەرهێنان لە هێلانەوە
لە دایک و باوک هەڵیان داواردن
حەوت و هەشت و نۆ لێیان دەخواردن
سەریان هەڵدەبڕی دایان دەماڵی
جەرگ دەبرزا بە گرفەی باڵی
بۆ کەس نەی دەکرد سەرکۆنەی ئەولاد ؟
بۆ کەس نەی دەکوت ئەی داد و بێداد
ئاخر ئەو دەعبا جوان و نەخشینە
کیژا سی شیرینە . کەیعەی لە زینە

ئەو لای بارکەی دەنووک چکۆڵە
دایک و بابی هەن پێی دەڵێن ڕۆڵە
خەزاڵە سوونا بە ئاوری جگەر
شکاتی بردە خزمەت پێغەمبەر
کۆتایی دێنم بەو کێشە کێشە
با نەبێتە هۆی دەرد و سەرئێشە
تەواو بوو چەقێ ڕازی بوو فەقێ
کابرا نەقە نەی بۆ دانی هەقێ
فەقێ لێی ئەستاند لە سێ بەش بەشێک
کابرا لێی ماسی زگ بە قەد خەشێک
لەبەر حۆیەوە بۆڵە بۆڵی بوو
بۆ وەسەر کردن هەوڵی خۆڵی بوو
وڕێنەی دەکرد وەک نۆبەتێ دار
ناڵە و زاڵەی بوو دەیکوت ئەی هاوار
من چی و فەقێ چی لەو کێوو تەپکە
کەنگێ ڕەفیق بوون عەمامە وشەپکە
ڕۆی و گەڕاوە، فەقێ ڕاوەستا
گوتی دەڵێی چی ؟ گوتی مامۆستا
توخوا قەدیمی بۆ فەرموویانە
نیزیکی زانا خێری نەزانە
ئەورۆ تۆ لە من بەهرەت بێ گەیی
غەیری زاتی خوا کێ تێمان گەیی
لێت خالی کردم هەمبانە بۆرین
پێچەوانەیە مەسەلەی گۆرین
ئێژن دەستەوا کارێکی خاسە
خۆتان ئەفەرموون دنیا تەقاسە
ژینی ئەم دنیا گاڵتەیەو گەمە
بۆ لە خۆت ناکەی ڕەددی مەزلەمە

لەو قیل و قالەت فێرم کە حەرفێ
با منیش پێم بکا لە تۆوە سەرفێ
گوتی خوێندووتە گوتی ناوەڵڵا
پێم بێژە بەڵکوو فێرسم ئینشەڵڵا
گوتی فێر نابی بەم دەم و دەستە
بەرۆکم بەردە هیچ رامەوەستە
بابێکی شەرعە فێر نابی بابە
باسی موخەننەس دەکا ئەو بابە
چی چی مامۆستا دادەی بی لێوە
دێوە درنجە ؟ چیە ئەو نێوە ؟
خۆ زۆریش چوومە حوجرەی فەقێیان
ئەمما لەفزی وام نەبیستووە لێیان
گوتی موخەننەس نەنێر نەمێیە
فێربی و لەجێی خۆی بیلێی بەجێیە
بۆ خۆی بە خۆی گوت ئەی خاکت بەسەر
بۆ سەودای کردت ئەویش سەر بەسەر
بە ناسەرسەنگی فێر بوو ئەو ناوە
ئەمما ئەو ناوە خێری بۆ داوە
مابوو دز و مات بۆ کەسری داهات
نەخشەی دەکێشا بۆ جەبری مافات
مەلی بژاردن یەک و دوان و سیان
دیتی تێیان دا دەعبایەکی جوان
زیت و زرینگێ دەنووک بچووکێ
بەربووک نەدیوێ رازاوە بووکێ
پاوانە داوین تەوقی لە مل دا
چاوی نەرشتووی تانەی لە کل دا
خەرمانی سووری شەنەی نەدیوە
نینۆکی ئاڵی خەنەی نەدیوە

هەر پەڕ لە ڕەنگێ بۆ ڕیزەکاری
هەر تارو پۆیەک نەخشێکی ساری
ئاڵ و چێرەیی سەوزو زەرد وسوور
هەر یەک بە لەونێ دەدرەوشا لە دوور
ژاڵە و گوڵاڵەی باغ و حەساران
ڕەنگین کەوانەی دوای ڕێژنە باران
جەرسە و حەریر و داماسی حەوڕەنگ
نەخش و نیگاری ئەرژەنگ وئەوڕەنگ
سەد نەخشی دیکەش بێنی لەمانە
باڵێکی دیقەی چاوی هەمانە
بەو جلک و بەرگە و بەو چاوە چاوە
شای نەوعی خۆیە و تەختی نەماوە
مامات و عاجز لەو نەخشە مانی
ڕامانی پێ ما کاتێ ڕووانی
نەخشی بێ گیانی مانی چ دێنێ
نەققاشی ئەسلی ڕووحی بەردێنێ
نەدی وبدی نی،بیزانی ڕەنگە
وەستای نەدیوە ئەو نەخش و ڕەنگە
ساتێ لەمەوبەر حاڵی سەخت بوو
کاتێ ئەمەی دی کەیفی تەخت بوو
ڕۆیی بۆ دەریای ئەندێشە وخەیاڵ
عەین وەک منداڵ بەربۆ گرو گاڵ
گوتی واباشە بیبەم بە دیاری
بۆ کوڕە چکۆڵەی پێ ڕاگەی شاری
زۆری خۆش دەوێ و ئاواتی ناوە
خێزانم جارێک مەمکی پێ داوە
سەوقاتی چاکە مەلێکی جوانە
خەڵاتم دەکا باوکی تاقانە

پێشینیانکوتیان تۆ مەلێ هەدوورە!
خۆڵبش وەسەرکەی لە کۆمای گەورە
ڕۆیی ڕێ وو ڕاست بۆ خزمەتی میر
بێ ڕێ بێکبران بێ گرفت و گیر
لەبۆی گێڕاوە ئەفڵ و سەرهات
مەلی حوانیشی داسە دەس ئاوات
دەستووری فەرموو میری خاوەن بیر
سەد دینار بدەن بە خاوەن نەچیر
پارەی پێ گەیی میری بێ تاوان
گزبری میری شێت بوو لەتاوان
وەک گولی بەخیل ئەو کابرای تایین
هیچی لا نەما نە دیس نە ئاییس
چوو پێی گوت میرم تەپکەچی زۆرە
زۆرت بۆ دێنن دەعبای ئەو جۆرە
ئەو بێنەوبەرە بۆت دەبێتە شوێن
لاڵ بم نەشی دەی دەس دەکەن بەجوێن
بۆ میری وەک تۆ میللەت کچە و کوڕ
سەر سوڕ دەمێنێ یەک قڕ بێ یەک بڕ
ئەوان خوازە خواز تۆ بێنە بێنە
تێی دا نامێنێ شاییەک خەزێنە
پلیش گیریم نەکەی لێی دەستێنمەوە
" غبن فاحش"ە "بدعـت"ە ئەوە
گوتی چون؟ گوتی بە فێڵی ئەوتۆ
ئیرادی نەبێ بۆ گەورەیی تۆ
دەڵێم ئەو مەلە نێرە یا مێیە
کامی گوت دەڵێم جووتەی لە کوێیە
لێک هەڵبڕاون بڕۆ بۆی بێنە
بە ڕەنگ و نەخشە عەین لەو وێنە

ئەو بوولەش دانی هەنا دەبهێنی
بەهیچ کەس مەلێن رازی نهێنی
بۆی بەبدا بانی و لێی دەستێنمەوە
چەپە شیعرانی لەبۆ دێنمەوە
حاکم کەوتە بیر فەرمودەی فەقێ
تێ کەبی گزیر لە قور شەچەفێ
رۆژی بێ حۆشبوو وەبیری بێنێ
پەندێکی بەسەر گزیری سێنێ
گزیر دەنگی دا کاکی تەپکەچی ! ؟
راوەستە ، گوتی قوربان دەڵێی چی ؟
دەڵێم ئەی برای دیاری پەڕەندە
لە ئەتلەس جوانتر دەڵێی پەڕەندە
نێرە یا مێیە ئەو دەعبا جوانە
مەبەستم هەیە بێژە کامیانە
وەڵامی داوە نە نێر نە مێیە
بابێکی شەرعە ، وتەی فەقێیە
ئەو فێری کردم هەر لەبیرم هەس
بە نەنێر نەمێ ئێژن موخەنەس
وەهای جوابداوە گورج و توند وتۆڵ
گزیر مەحتەل ماوەک گای سەرسەهۆڵ
میر شاگای لێ بوو قاقا پێکەنی
لە ماڵی دنیا کابرای کرد خەنی
کەلیمێک زانین ئاوا بە کەڵکە
نیزیکی زانا قازانجی خەڵکە
برۆ بخوێنە رۆڵەی شیرینم
سوکنایی دلم سەرمایەی ژینم
خودا فەرمویە ها لە قورئانا
شایا وەک یەکن نەزان و زانا

بۆ زانین فەرزە وەک مامرچینە
ئەمری پێغەمبەر بۆ چوونی چینە
مەودای خوێندنی کێ خاوەن مێشکە
تا گۆرپچەیە لە بانی بێشکە
تۆ پێت وانەبێ خوێندن بازی یە
خوێندن کارخانەی ئادەمسازی یە
خوێندن سەرمایەی ژین و حەیاتە
خوێندن پێک هێنی هیوا وئاواتە
خوێندن ئاوێنەی بێ وێنەی هاتە
خوێندن ئاوێنەی نوقلّ و نەباتە
لە دەشت و دەریا عەسای مووسایە
وەبیرت دێنێ " هی عصا "یە
لە ویشکی و ئاوان مەل وماهی یە
وەدەستی بێنە و بێزە "ماهی"
نە کێو نە چێوه بلێند و بەرزە
سەری لە ئاسمان بنی لە ئەرزە
زەوی ئاوا کرد بەبێ هەراو بانگ
دای لە شەقەی باڵ چوو بۆ کورەی مانگ
وێستاون لەوێش بە سەف موشتەری
دەڵێن چاوەڕێن زوهرە و موشتەری
هیواپێک هێنە مایەی بژیوە
وەک رۆژی روونە و لە چاو نەدیوە
نێوی زانینە و نە بۆتەی وینە
لە بەحری ینە و لە جەو سەفینە
بەرێی زانین دا رۆین بۆ سەما
ێگانەی زانا بە رەقس و سەما
ێ زانین و زۆر ناچیتە ئاسمان
لە " الرحمانا الا بسلطان "

بووکی شارانە شاری سۆکانێ
کانی زێڕینە گەوهەری کانێ
دیمەنە، چیمەنە، چەمە، باغە
خوار سەقز ڕۆژهەڵاتی سابلاغە
سەددی زێڕینە روودە لای شەرقی
بۆ شیمال رووکە میاندوا و بەرقی
لە هەوەڵیان مەلەی بکە بە دوێ
لەوی تریان بە شارەری بدوێ
دەوروپشتی کەل وتەپە و دەشتە
دڵگر و دلڕفێن و جێ گەشتە
جۆیە، جۆبارە، کانی یە، ئاوە
وەک بەهەشتێ دەچێ لەگش لاوە
حەوزەکەی چەشنی حەوزی باغی ئیرەم
نەبە دیناری سازبووە ونە درەم
شانەهەنگوینە ئاوەکەی بەخەواس
پوورە پەروینی ها تیا رەققاس
دوڕ وئەڵماسە خیزەکەی تەختی
گەوهەرئەفشانە بەو دڵی سەختی
یەک دوو مستان وەخۆوڵێ ئۆخەی
"ومن الماء کل شیٔ حی"
ئەو قەڵا بەرزە کاخی سەردارە
سەربەرز لەو دیارە ئەو دیارە
چوارەکان رووحی هەرچواروو شاد
چوار یار یارو بێ وعەداڵەتو داد
لێو ببوورێ خودا هەزاران جار
هەڵبژاردن وەها دەبێ جێ شار
چۆمی سیمینەروودی پێ دادێ
ئەم بەری شارە ئەو بەری لادێ

وەک مصلّایە باغی میراوا
هەر بحۆ میوە سێزە مالاوا
ئاوی چاوان وەخۆنە روکناباد
کلی چاوانە خاکی عەلیاباد
شاری بۆکانە جێی ئەدیبانە
شاری میوانگر و غەریبانە
کێ دەبینی لە شارو ئەتراف
لە کەمالّ و هونەر نەبێ مافی؟
هەموو مزگەوتە کانی پێنج فەرزە
بانگی "اللەاکبر"ی بەرزە
حەوزو ئاوی تەواوی جێ نوێژ ن
نوێژ نەکەر هەرئەوانی بێ نوێژ ن
خۆشە ئاوو هەوای نەگەرمە نەسارد
پڕە عەمبارەکان لە گەنم و لە ئارد
باوکی گشت ئەوهەموو کوڕونەوەبوو
عاشقی نانی گەنمی"یەکشەوە" بوو
شاری بۆکان"حەقیقی" لێرە ئەزی
شوکری ئاووهەوات نەکا چ ئەزی

" بانەمەڕی ١٣٦٣ "

ئەو نوختەی پەرگاری کێوە        تەنیایە و دنیایەک نێوە
تۆماری سووری گەردوونە        گەردوونەی چەرخی ئەزموونە
مەڵبەندی شیفای ئالامە        دەرمانی ساڕێژی زامە
رۆڵەی شێری وەرکەوتووە        بەوری دەوری سەرکەوتووە
مهابادی هیوا بەرزە        سەربەرزی پارێزەر مەرزە
کانوونی شیعر و هەڵبەستە        نەختێ ئەهلی دڵ بی بەستە
وەفایی دڵداری عیشقە        شیعری شیرین شاری عیشقە
باغی سیسەی گوڵی گەشە        دڵی بەخەم دەکا نەشە
دەم چۆم و باغ و گوڵزاری        بەهەشتێ دێنن بە دیاری
بێ سایەخە بەیبوون لەوێ        نەسرین وگوڵ بێ بۆن لەوێ
کەزوو کێوو ماه وزەردی        دارو چێوو هەرد و بەردی
خەمتارێن و خۆشی هێنە        جێ ڕاوی باز و شاهێنە
کانگەی میرانی سەربەرزە        دەنگی بەرزە لەوسەر ئەرزە
گوڵ دایم بازاڕی گەرمە        بولبول بێ دەنگی پێ شەرمە
لەو باغانەی رەنگاورەنگن        ماملێ وشاروخ بۆبێ دەنگن
گەر پردی سووری خاپوورە        سەددی چەشنی دەریای نوورە
لاوی شێری پێ مامزە        کیژی بە مامزی دێ بزە
ئەو جەرگی هێندی میرقازە        ئەم سەروی ناز و چاوبازە
بترازێنێ دوگمەی یەخە        عوود و عەنبەر بێ بایەخە
لەداوێنی "مەحموودکانی"        لەنێو باغ و چۆم و کانی
مردووی لێ زیندوو دەبنەوە        دەرد وخەم لەبیر دەچنەوە
"مزگەوتی سووری" جومعانە        قوببەی نووری تا کەیوانە
لەمەر قەبرستانی کۆنە        کاکی رێبوار بیرت چۆنە ؟
بداق سوڵتان ، مەلا جامی        شێخ تەها و ئەوانی نامی
هاتف پێی گوت نیشتمانی        کورد ستان بە تۆیە مانی
شێری لانی خاوەن هەستی        سووری گەردوون پێت ناوەستی
وەک ئاسمانی حەو نهۆمی        بەگرمەی هەوری ناچۆمی

هەوراز ت هێلانەی بازە		بن بەردت جێ ژوانی رازە
گەرچی تالێ وسوێریت دیوە		چاوت روونە وکوێریت دیوە
بەڵام ئێستا رۆڵەت زۆرە		خزمەتت دەکەن بەنۆرە
دەڵێن ئێمە تیرەی مادین		بربی بین تینووی ئازادین!

"بۆکان - ١٣٦٤"

دەستی حیکمەت دوای جووتی جس
لەسنەی دانا یانەی زاجس
کۆتری جینەی ئەو زانینە
چەشنی پوورەی مێش هەنگوینە
ڕەستەی زێر و زانابانە
هەستەی وازە و مانا سانە
جێی میری مەزن و مەشهوورە
گەنجینەی تێدا مەستوورە
شاخ و داخی بەزمانی حاڵ
دەیڵێن و حاڵیس ئەهلی حاڵ
ئەی راوێژگەی خان و میران!
تەکیەی شێخ و چاک و پیران!
تۆ مانگی ئاسمانی بەرزی
ئەستێرەی رووناکی ئەرزی
بۆ شک مێشکی ئەفلاتوونی
چۆن لوقمان و ئەرەستوو نی؟
کوانێ سولەیمان و تەختی؟
کوا ئاسەف وەزیری وەختی؟
لە خانەدانی ئامانللەی والی
کێ بوو خێوی بانی عالی؟
نێوبانگ و نێوی "ئەردەلان"
لە مێژوودا بەرگی تەلان
کێتدی لە خانەی مەردۆخی
دەفی دەنگیدا یا کۆخی؟
"سێدقطب" ئەودەم کردی گوڵ
چەپکێکیدا دەس "خڕم دڵ"
دەنگ خۆشی داود پێغەمبەر
بو "سەبدئەسغەر"جێ ما و"مەزهەر"

بۆ مەدحی "دارالاحسان"ی
کێ بێنم وێنەی "حسّان"ی
نووری عەینی سەیتی قودسی
دەدرەوشێ تا عەرش و کورسی
ئەم وەک رووحە وجیسمە "ئەزهەر"
ماڵگەی ناوێ شەمسی ئەزهەر
روانگەی شارو چۆم و باغی
سەیرانگەی سەددی قشلاغی
پێتی دەنوێنێ دنیای دی
پێی ناوێ گەشتی دنیای دی
بورجی پۆلای روویین دژی
هەر سەربەرزو خۆش بی و بژی

"بۆکان - ١٣٦٤"

دوڕدانەی خۆشی سەردەشتە
باغ و سەیرانگە و جێ گەشتە

سەررو سرم و شاخ و داخە
کاخ و کۆخ و دار و باخە

بووکی ڕازاوەی ئاواتە
شاباشی بەهرە و داهاتە

خشڵی یاقووت و ئەڵماسە
خەڵکی حەرسر و داماسە

خوا ئەرزی قودسی بێ داوە
پیتی هەنگاو بە هەنگاوە

بۆ نەوعی بەهرەی مارووە
عومری نووحی تێدا ڕووە

گەڵای گەزۆیە و گوڵ میوە
خۆرایی بەهەشت و حیوە

مەستوورەی باغاتی "خولدە"
هەرتێیدا هەڵسووڕێ و خولدە

باغی ئیرەم وا بوو واچوو
ڕیشەی لە سەردەشتێ ڕاچوو

"نێورانی" دیقەی بێڕووتە
ڕەشت و گێلانی بێ ڕووتە

کەس نەیزانی ئاوی ساردی
کەوسەر کێ هێنای کێ ناردی

"خدر" ئاوی ژینی هێنا
کێ شانەی هەنگوینی هێنا

بۆ وێنەی "تەنگی گرژاڵی"
"مانی" باسکی لێ هەڵماڵی

پەشمی پەمبە و زێڕی مس بوو
ڕەنگی چوو ریسی پس پس بوو

گوێزم! بۆ ساعەت "زمزران
بەخشە و بوخشەی لێ هەڵگیران
" شیرەم" لەحاندی بێ رەنگە
باغچەی بەهەشتێ بێ، رەنگە
دوای سەیری سەرچۆمی"کەڵوێ "
فەرموو بۆبێتو باغی "هەڵوێ"
قاسپە و گمەی شەوناو چڕە
کەوسارە، کۆترە، کوڕکوڕە
لەسەر چەشنی میوەی زۆرە
کیژی جوانی چەشنی حۆرە
سەروەو جووتێ سێوی پێوە
سەر وی خونچەی دەم و لێوە
قووتی رووحن مەم و دەمان
دڵ چووڕانێ زەم و دەمان
پۆلی مامز لە گەڵوانن
کاروانی دڵ لەگەڵ وانن
کاتێ دێن بۆ بەرِوو رنین
"کاروانکوژ" دێ بە روو رنین
بۆ دین و گەشتی بەندەنی
کوێرن پاریسی و لەندەنی!
سەردەشتی منداڵ و گەورە
لەحاندی دوژمن وەک بەورە
باغات و ئاوی هەڵدێری
حەوزی سەرز و چۆمی ژێری
زستان، هاوین، پاییز، بەهار
"تجری من تحتها الانهار"

" بۆکان ـ ١٣٦٤"

سەقز سەهۆی ئەژماری " ئەب"
" جەد" یانی" جای علم وادب"
شارێکی مێژوویی کوردە
جێی ئەندێشە و فیکری وردە
بەڵگە و شوێن و شوورەی شاری
سی چل قەرنی داوە دیاری
شێخ و زاهید، زانا و مۆمن
زۆرن ناشەژمێرێ بۆ من
دەدرەوشێ نووری عیرفانی
وێنەی غەزایی و عوسمانی
حەسەن شێخی " مەولاناوا"
مەولا لە ناو مەولا ناوا
هونەر چەندی بێژی زۆرە
هونەرمەندی کەش بەو جۆرە
شاگردی خەتت و نەققاشی
بە موقلە و مانی گوت: ناشی
شاعیر زۆرن جێی شانازی
وێنەی "شپرزە" و " شیرازی"
پارکی شاری لەو داوێنە
دەنوێنێ وێنەی ئاوێنە
جێ گەشتی گەنج و پیرانە
راوێژگەی رۆشن بیرانە
" قەڵای زێویە" و "ناری قەڵا"
لایان مسن نوقرە و تەڵا
گوڵی کێوان " وەنەوشە"یە
چرای ئەو حەول و حەوشەیە
چوارساڵ لە باوەشی دابووم
بە بەر دەمیا هاتووم و چووم

ئێستاش بە بۆنی وەنەوشە
دوای هەشتا ساڵ دڵم گەشە
" مەرعوز" بێشکەی منداڵیمە
جۆلانەی شیرنی و تاڵیمە
گڵکۆی سولەیمانی لێ یە
برای گەورەم هاڵەو دێ یە

" بۆکان – ١٣٦٤"

ئەو ساڵەی وا ئارمسترانگ
سواری سەفینەی بوو چۆمانگ
بەهۆی تلسکۆپی قەوی
سرنجی‌دا کورەی زەوی
سەفینەی دی وەک سەییارە
لەنێو دەریاچێکی دیارە
لەبەر حیرەت‌کەللەی ماسی
بالندەی لێ بوو ماسی
مانگیش دەتگوت بووکی شاوە
ئاوێنەی بۆ راگیراوە
شاباشی نوقرەی ئەستێرەن
ئەستێرەی عاسمانی لێرەن
حاسڵ سەرسوڕمانی هێنا
بە یەزدان ئیمانی هێنا
ڕاما و داما داخۆ کوێ بێ ؟
ناکا سەییارێکی نوێ بێ ؟
جێ بەحرەو دەدرەوشێ ماسە ؟!
یا کانگەی دوڕ و ئەڵماسە ؟!
دەستی مووسا و کێوی توورە ؟!
یا مەستوورەی دەریای نوورە ؟!
عەرزە و لای رۆژئاوا بوونە ؟!
یا بەرگەردانی گەردوونە ؟!
سەرلێ شێواو بوو ئەندێشە
" کامپیوتر" سرنج راکێشە
بە وەرگێڕانی ئەژمارە
بڕیاری‌دا زرێبارە
دەریای مێژووی مەریوانە
شاری ژووڕووی کوردستانە

بە گوێرەی چیرۆکی کۆنە
جێ شاری دەروێشی خۆنە
حاشا بە عەدرو شاهۆ چوو
زانستی بەنگیس بوو ڕۆ چوو
میعمانیی کەشتی جەوی
تەنیا لەجاندی وی نەوی
مرۆبان بڕوایان وایە
"مربوان" "واو"ی پێش "یا"یە
گشتی زیر و دانشمەندن
نائەزمێرێ بێژی چەندن

"بۆکان ـ ۱۳۶۴"

بۆکان ماسای سووکی شاران
بنکەی خانان و سەرداران

مەڵێ ساقی کسرا تەرزی
تاقە و چوارن بورجی بەرزی

بۆ بێشواری عارسرانی
بستووتە و دبوتەودەبزانی

کاسی هاسی جەرحی گەردوون..
سەوری دێبا بۆ گاو گەردوون

لە حاندی سەرچاوە و چۆمی
چاوەی چۆمی جەیحوون چۆمی

بێتوانگی "گۆمی سەر سەکۆ"
رۆبی بۆ "کۆ" و "باکۆ" و "ماکۆ"

"دەریاچەی ورمێ" و "شاگۆلی"
وان لە قەراخ شار و چۆڵی

ئەم ، قەلبی باغات و شارە
عەرز و ئاسمانی لێ دیارە

ئاوی روونی "حەوزی گەورە"
وەک ئاوی کەوسەر بێ غەورە

پاساوکێکە بەحری قولزم
پەرزینی گوڵ! عەینی زمزم

ئاوێنێکی بالا نوێنە
لە مانگێ هەڵدەگرێ وێنە

ئەرزەی هەوری گەواڵ گەواڵ
تیشک بێ ئەنگێوێ بەحاڵ

لە تەختی حەوزی بێ غەوشی
چەشنی ئەڵماسێ دەدرەوشی

ئەسکەندەر بەر لێ شێواوە
ئاوی ژین یانی ئەو ئاوە

لە سەر ساكى "ناڵەشكێنێ"
"حەسەن زيرەک" خۆى دەنوێنێ
فووتى رووحە دەنگى خۆشى
خۆش بێ بانەم ماىێ خۆشى
دەنگى هەر سزرينگێتەوە
مردووى پێ زيندوو بێتەوە
سێ مزگەوتێكى تێدايە
حوممە و حەماتى بەرپايە
شار و دێهات ئەم بەر ئەوبەر
خەتتاتە و نەققاشە و هۆنەر
چۆم و ساغ و قۆرغ و مێشە
تەرخان بۆ فيكرو ئەندێشە
"حەقيقى" ماڵى ها لێرە
چاوەڕوانى دووعاى خێرە

"بۆكان ـ ١٣٦٤"

جارێکی ستێنم سانە
دەڕوا لەسەر چاوم تانە
نەخشی خۆکردی داداری
بەهەشتی و نەختێ ساکاری
لە سەر نووچکەی روانگەی دیمەن
دیاری وەک باخچەی نێو چیمەن
ئەفسانەی گۆڕین دێنیە بیر
مانگی چاردەی کەوتوویە بیر
هەرچی خوا بەو بەندەی داوە
لەو مەڵبەندەیدا خولقاوە
دارستان و لێڕەواره
سوختی پوختی بەڕوو داره
رەز و باخ و شاخ و کێوی
لک و پۆپی ، دار و چێوی
میوەی رەنگا و رەنگی پێوه
لێی شین نەبووە ئێمە وئێوه
هەنار و هەرمێ و سێوو بێ
قاوت‌لێ دەکەن ئێزن بێ !
مێوژ و گوێز و گەزۆ و مازوو
بەدوای یەکدا دەگەن زوو، زوو!
تووی شیرن خەرمانی سووره
نوخشەی هەنجیرو هەنگووره
شان و یاڵ و شیو و دۆڵی
هەرد و بەرد و خاک و خۆڵی
خێرو بێر و بەهرەو پیته
خەڵکی وێ بێ فیکری چیته
شارێکی زۆر میوانگره
قەت‌نەی دیبی پێت‌ئۆگره

میــــری و مــەزنــــی"یۆنس خــــانــــی"
" رەزا" نــــووســی لــە دیــوانــــی
" شــارســابــا" فەخری "سەیوان"بوو
ئــەو دەم "کاک ئەحمەد" میوان بوو
دەریـــــای زانســـت و عیـــرفــانــــە
شـــاری عــەقیـــدە و ئیمـــانــــە

" سۆکان ـ ١٣٦٤"

شاری شنۆ بورجی بەرزە
قەڵای پۆلاینی مەرزە

ئەو کێوانەی دەورەی داوە
حەسارە و بۆ دوژمن داوە

رووکاری ئەمدیو ئەودیوی
زەرد و ماە و دۆڵ و شیوی

بانوو بانوو ئەمبەر ئەوبەر
ئەسکەندەر لێی گرتوون سەنگەر

نێوبانگ و نێوی سمکۆیە
کەیبۆ پاریس و مسکۆیە

میر و مەزنی لێ میوانە
مەنزڵگەی شێخی بارزانە

ئەوانەی قوتبی عیرفانن
"عبدالعزیز"و "سوڵتانن"

"ئەحمەد" کوڕی بینادڵ بوو
لە باغی عیرفاندا گوڵ بوو

"عەلی" زەرفی عیلمی سەرفە
عالەم لەوڕا بردی سەرفە

بۆ کەس نەی پرسی لەو ناوە
شیعری "ئەمین" لای کێ ماوە ؟

خاکی پاکی بەهرە و خێرە
"شام" وێنەی هەڵگیرا لێرە

چۆمی "گادەر" حەوت و هەشتن
دەشتی گشتی وەک بەهەشتن

یەک دوو رووبار و جۆبارێ
جیران بۆی ناردی بەدیاری

باغی دین لەو دەشت وکێوە
رووسووری و سەربەرزی پێوە

شنۆ ! پیری بەڵام شادی !
نۆسەد ساڵی پێش میلادی
ئەگەر دەشڵێی شاهید بێنە
بەردی " کێلەشین" وەخوێنە

" بۆکان – ١٣٦٤ "

خۆشی لەخۆت شاری پاوە
ناوت لە دنیادا قاوە

کورتەی بێرووت و لوبنانی
چاوی راستی هەورامانی

حەول و حەوشت تاکوو سنە
بابولسەر و رامسەر چنە

مەلبەندێکی خوا پێ داوی
وەک باغی شەدادێ ماوی

بۆ گول بۆ لالە و نەسرینی
بولبول کێشکە و تۆ پەرزینی

ئەودەم سەییاح بووم گەشتی بووم
لەگەل نووح سواری کەشتی بووم

دیمی لەسەر کێوی جوودی
وێنەی بەهەشتی مەوعوودی

"بۆکان – ١٣٦٤"

گەر مەردی و رەندی تاوانە
وەستۆی دەگرن خەڵکی خانە
کوردی گورد و مەردی مەرزن
لەحاندی دوژمن نالەرزن
دەشتو کێو و هەرد و بەردی
شادەن بۆ جوامێری و مەردی
لە چاکی و راستیدا تاکن
یەکرەنگ و دڵ ساف و پاکن
لەوێ میوان خانەخوێیە
خانەخوێ نازانی کێیە
پیر و جوانی پیرانشاری
وەک پیرانی وەیسن کاری

"بۆکان – ١٣٦٤"

لە ئەحوالی ئیمامی گەر دەپرسی چۆنە بێ ئێوە
سەری سوڕماوە لەم کوێستانەدا بێ هەمدەم وحێوە
بکەن رەحمێ بە حالی هەر بەحالێ هێزی لەبەردا بە
عەجایب گیری کرد لەم سەرزەمینەی پڕکەژو کێوە
مەلێن کوێستانە جێگای لێی کەڕێن قشلاق وبزولنە
بەئینسان چی کەحەیوان تێرئەخوات وخەلقی بێ شێوە
ئەگەرچی گیاوگزی ئەم سەرزەمینە سەوزو تێرئاوە
بەلام بۆمن لەدووری ئێوە وبشک و پڕ چڕ و چێوە
فیداتان بم وەرن لوتفوو هەبێ رۆژی هیلاکەتمە
تەیەن بێ نێو نیشانم،بێنە لام هەر کامیلم نێوە

.......................................

ئەمە وچەند شیعری دیکە کە لە مامۆستا سەید کاملی ئیمامی ـ یە ولەو کتێبەدا چاپکراون چەند نامەیەکن بە شیعر کە مامۆستا لە بەینی سالانی ٣١ و ٣٢دا کاتێ مالی لە کانی بەن بوو بۆی ناردوومەتە بۆکانێ کەمنیش هەر بەوشێوەیە و لامم داوەتەوە.

ئیما مینامەکەی نامی گەیشت و نامە سەرچاوم
لە دووری تۆ دەبارێ دایما فرمێسکی خوێناوم
بەبێ مانگی مبارەک لێم حەرامە چاوەکەم بێ تۆ
پلاوو گۆشت ودۆڵمە و مەشکەفی و فرنی و هەلیماوم
لەبەر رۆژوو نیە، دووری لە دینی تۆیە گەر مردووم
ئەجەل دەورم دەدا هیوای ویسالی تۆیە گەر ماوم
رەفیقانت لە هیجرانت بەجارێکی هەموو سووتان
بەناری عیشقی پاکی تۆ بە تەنیا من نەسووتاوم
کە فەرمووتە فیداتان بم وەرن رۆژی هیلاکەتمە
چ حاجەت هات و چۆ بەینی من و تۆ بۆیە داماوم
لە قوللەی قەلبی یاران خەیمەیی نازت وەها هەڵدا
لە خانەخوێ و لە میوان غەیری تۆ نایێتە بەرچاوم
لە رێگای عیشقی تۆدا رەهرەوانت هیچی ناوەستن
هەموویان کامیلن وەک تۆ نە هەرمن سەرلەپێناوم
ئەگەر وابێ ئەوەی دۆستی حەقیقی بێ لەبیر ناچێ
بە قەولی کاعەزیز بێت ونەبێ پێلاوی سەرچاوم

چ خوش بوو قاسیدی یار شیعری ئاوداروتەڕی هێنا
زیاوە باغی ئوممێدم ئەوا بەرگ و بەری هێنا
هەزار ئەحسەن حەقیقی عەنبەرئەفشانی دەکا شیعرت
فیدات بم قاسیدت موژدە و نەویدی خۆشتری هێنا
خەریک بووم من نیساری رێی بکەم هەرچی مەڕومالە
کەچی دڵ هاتە پێش ماڵ ومەڕی لابرد سەری هێنا
لە جوابی شیعری ئاودارو تەڕی تۆ عاجزن شاعیر
بەسەد زەحمەت بچووکی خۆت دوسێ شیعری شڕی هێنا
بەعەزمی کوشتنی دوزمن عەجەب غەوغاو ئاشووبە
بڕۆی تۆ خەنجەری کێشا موژەی من نەشتەری هێنا
لە دووریت مردبووم ئەمما نەسیمی لوتفی تۆ دیسان
مەسیح ئاسا لەگەڵ خۆی نەشئەیی رۆح پەروەری هێنا
کەوا پارچەی غەزەل دەبڕین لەدیوانی مەحەببەت دا
ئەتۆ پشتی غەزەل دەبڕی ئیمامی ئەستەڕی هێنا

ئەوا سۆزەی بەیان دیسان پەیامی دڵبەری هێنــــا
نەسیمی رووح پەروەر عەتری عوودوعەنبەری هێنــــا
شنەی بای مەرحەمەت دیسان لەلای کوێستانی کانی بەن
چ خۆش بۆنی هەڵاڵە و سوێسنە و سووسەنبەری هێنــــا
نە زیندوو بووم نە مردوو نامەکەت ئاوی حەیاتی دام
نە قاسید بوو نەکاغەز ساقی ئاوی کەوسەری هێنــــا
لە وێنەی سونبول و لالە وگوڵ وگوڵ ئەتلەسی وشەوبـــۆ
حەریروئەتلەس و جەرسە و قەنەوزو مەخمەری هێنــــا
لەرووی نەخش و نیگاری پیرەکوێستانــی تەبیعەت بـــوو
موهەندس چوو نموونەی رامسەر و بابولسەری هێنــــا
سزد گر زندە گردد مــردە از نامت مسیح آســــا
کەوابۆ مەسکەنی سەردار نامەی ســەروەری هێنــــا
عەزیزم شەرحی دووری تۆم شەوێکی تاکوو رۆژ نـــووسی
سبەینێ زوو قەڵەم ئیعلانی خەتمی دەفتـــەری هێنــــا
قیامی قامەتت بۆ ئەهلی دڵ قامی قیــامــەت بـــوو
قەتاری کۆچ و بارت بۆ موکریان مەحشـــەری هێنــــا
گڕی دڵ زۆر بەتینە وازوو ناکووژێتـەوە کــامیـــل
حەقیقی دەستەچیلـەی دڵ ئیمامی ئاگــری هێنــــا

گەر دەپرسی چۆنە کامیل کاکە دەردی کاری یە
پرسی یە ، بێ هێزو گێژوویژە کاری زاری یە
ڕۆژ حەواسی پێ نیە شەو خەستە ووتەنبەڵدەڵێی
کۆڵەکێشی کردووە تاکوو سەحەر هاواری یە
وا بڵاوو دەرهەم ولەتلەت بوو وەک زولفی بوتان
فیکر وئەحواڵ و حەواسی عەینی تۆوی شاری یە
غەیری کوندی ماڵ خراپ وویشکەسۆفی ریش درێژ
کێ دەڵێ ئەم وەختە خۆشە گەرچی ئەمری باری یە
مامەلاش رەببی کوت وپڕبێ هەدادانی نیە
کاری هەر قوولە وهەرایە ئەم سەروئەوخواری یە
خۆشی یە لەو چونکە مانگی خێرە سەرفترەی هەیە
دەک بەزووخاوی رەشی بێ هەر بەفیکری زاری یە
نان دەخۆم ئەمنیش بەقوززەڵقورتە ،چا زووخاومە
گەر دەپرسی چۆن دەژی کامیل ئەویش بێ عاری یە

کامیل ئەو مانگی مبارەک فەرزو ئەمری باری یە
مانگی سوننەت و تاعەت وسەرفترە وو دینداری یە
لەرزەی رۆژوو ئەتۆ تێ بیگرە عەینی رەحمەتە
حواردنی رۆژێ ئەتۆ سڕوانە زەهری ماری یە
دەنگی قورئان خوێندن و اللەاکبر دێ مودام
کەی لەمانگی دیکەدا تۆ گوێت لە دەنگی قاری یە
بیست وحەوتەم حامیلی قورئانە جەبرەیلی ئەمین
حامیلی وەحیی موبین بۆ ئەحمەدی موختاری یە
لەیلەتولقەدری کەوا سەف سەف مەلایک دێنە خوار
دەرکی رەحمەت بازە عاسی وەختی گریەو زاری یە
دەرکی دۆزەخ داخرا دەرکی بەهەشت ئاواڵە یە
موژدەبێ رەحمەت دەبارێ باری عامی باری یە
سەیقەلی زەنگی مسی ساڵێکە سەرفترە و زەکات
مشت ومالی نەفس و ماڵە سوننەتێکی جاری یە
مام مەلای بێچارە چبکا ، کاروبارێکی نیە
بازدە مانگان خەوتووە وئەومانگە وەختی کاری یە
کاکەگیان ئێستا "حەقیقی" زەوقی جارانی نیە
تەبعی تۆ سەرشارە ئەمما شیعری من ئیجباری یە

ئەڵڵاهە شوکرێ لەکێ عەمەلدەن قوتولموسەن
دوکتور گوتی حەقیقی دێیکوێرم نەئیستەسەن
روون بێ گوتم گلێنەم وبی بینم و بلێم
سەرچاوی من قزلجی بەخێری مەلا حەسەن*
جبران هجر سی وسەسالت چەسان کنم
کاین مدّه در فراق تو کم شد ز عمر من
فەسڵی بەهارە بولبولی باغی ئەدەب وەرە
حازر لەبۆ نیسارە گوڵی یاس و یاسەمەن
بارانی شەوق ئەبارێ لەهەوری گەواڵ گەواڵ
خەملیوە دەشت و بەندەن و کێووکەژوچەمەن
فەسڵی گوڵانە ، خونچە دەمی دا گەیشتە جێ
خێڵ و قەتاری خەیری و خەتمی ونەستەرەن
فەسڵی گوڵانە کاتی بەیانە بلێم چیە
مەستی تەبیعەتن لە گوڵی سوور هەتاگەوەن
یا سۆزەیێکی دێ ودەشەکێ شۆڕەبی بە ناز
یا سەروی ناز ،ناز دەفرۆشێ بەنارەوەن
لای سوێسنە وهەڵاڵە و بەیبوون بەدینی مەن
سوێزە خەتایە سوحبەتی میشکی خەتاوختەن
قاقای قەتاری قازوقورینگی سەر ئاوەکان
لەو دەشتەپانە مەحشەری کوبرا بەپادەکەن
دڵ نەشئەیە بەباڵەفڕەی کۆتری تەقلەباز
سەرمەستی قاسپە قاسپی کەوی نێوچڕودەوەن
لێم سوور بووە بەهاتنەوەکەت ساڵی دووبەهار
بەو نوکتە باوەڕم نەبوو دەمگوت فشەوقسەن
شەوگاری تارو ڕۆژی ڕەشت دی لەڕێی گەلا
ژینێکی چەوت وپڕلە پەژارەوخەم و میحەن
قوربان زەمانی ئێمە مەحەبەت پەڵەی دەدا
ئەوڕۆ کەڵەک بەبارە ،چ شت بۆڵەفێڵ وفەن

تۆ حاوەی فەزیلەت وەس موحلیسی فەدیم
ئەمما بەگیانی تۆ هەسەم ورایی دوالیمی
مردووبەرستە حامیعە قەدری سەن وەمەنی
وەختێ دەبێ کەشوێنی بەمنی بێ بەسەن بەسەن
دووچاوە چاوەکەم هەسەدل بەنکەختی بە
کاولاشی تۆیە هەردوو حەسانی مەلا حەسەن
" سۆکان - ۱۳۵۸ "

---

لە هاتنەوەی ماموستا حەسەنی فزلجی سووسەری سەناوسانک
- دا گوتویەتی .

سولتان برای بەڕێز و فیدایینی بەگیان ودڵ
دڵ بێ قەراری تۆیە دەسووتێ میسالی کڵ
فرمێسکی چاوەکان و چزەی جەرگی لەت لەتم
وەک قرچە قرچی سیخی کەباب لەسەر سکڵ
بۆکان وئاوی شۆرەتی یە وبێ وجوودی تۆ
باغێکی ویشکە دڵ وەرە بڕوانە چڵ بەچڵ
ڕنگماکی ئولفەتی من وتۆ وەک دووانە وان
دوو رووحە یەک تەبیعەتە دوو جسمە یەک شکڵ
بەینێکە تۆ نەدێی نە دەپرسی لە حاڵی من
عاقڵ سڵە ببینێ لە یەکتر دووانە سڵ
خاکی دەروونی باغەکەت و دارو چێوەکەی
بۆ چاوی دۆستان کلە بۆ دوژمنان چقڵ
دنیا چیە لەیەک نەدوێن ونەدیو بژین
تۆخوا وەرە هەتا نەکراوە زمان قفڵ
ئاوێتەیی محەببەتە ئاوو گڵی دڵم
تا ئەودەمەی کە ئێسک وپڕووسکم دەبن بەگڵ
تیشەی ئەوینە تیژە نە فەرهادی کۆهکەن
شیرینە بێستوونی ڕەقی کردە خاکی مل
پێنجن فیدایانی حەقیقی لە ڕێگەتا
سیپەلک وسیکەتۆرە ووجەرگ و دڵ وسپڵ

"بۆکان - بانەمەڕی ١٣٦٠ هەتاوی"

حەسابی قازی وەعدەت‌دا شەوێ دێم
کەچی وەعدەت‌شکاند وشەونەهاتی

حقووقی پازدە رۆژانم خەرج کرد
کە قازی دێ فەراهەم بێ بیساتی

ترێ و کاڵەک بەپێی فیلان کڕابوو
چ کاڵەک هەر وەکوو قەندونەباتی

وەتەیارەی دەچوو هاڕەی سەماوەر
خوڕەی چایی وەکوو چۆمی فوڕاتی

گەلێکت مونتەزیر بووم ولە پاشان
خەبەریان دا کە قازی چۆ دێهاتی

خیلافی وەعدە رەسمی جاهیلانە
لە تۆ عەیبە ئەتۆ قازی وڵاتی

شەماڵ ئەی قاسیدی چالاکی هەوراز و خڕو لێژم
بڕۆ شاری غەریبان و بەرە پەیغامێ پێت ئێژم
بڵێ ئەورۆ لە باغان شینی بولبول بۆ گوڵی سوورە
لە دووری ئێوە ئەمنیش خوێن دەخۆم فرمێسکە دەیڕێژم
عەزیزان گشتو وەک بینایی چاوم بوون لەدەستم چوون
دەسم ناگا بەداوێنوو پلاری کوێری داوێژم
وەکوو نەی کون کونە جەرگم لەبەر ئێشی جودایی تان
لەبەر تاسە و سەرم تاسا لە گێژاوی خەما گێژم
بە یەک یەکیان بڵێ گیانە قەسەم بەو عەهدو پەیمانە
کە بەستوومانە تا ئەودەم چ دەم نێژن چ دەونێژم
لە دروێنەی خەمان شەرتم پەڕیوە سوورە خەرمانم
کەو و بێژنگی تەبعم بوونە هێلەگ چۆنی دابێژم
دەوای زامی دڵم بوون کات وساتی سەردەمی پیری
ئەوا کردی تەشەن دیسان برینی کۆنە ساڕێژم
کراسێکە بەبالای من بڕاوە تاڵ و سوێری ژین
کەهەر ئەسرینە دەیڕێژم کە هەر زووخاوە دەیچێژم
خەزان هات و نەما گوڵ ، ماینەوە تەنیا من وبولبول
نە ئەو یار و نە من هەمدەم خەمی دڵ چۆن دەراوێژم
نزیکی جێژنی قوربانە رمێنی خێر و ئیحسانە
دوعای دەوری حەرەم فریا و کەوێ وپاڕانەوەونوێژم

" بۆکان ـ ١٣٦٥ "

مکرو ئەمدینە حەریکی لەوەڕێ
هەر وەکوو کاوڕەلەڕی سەرگیشێ
تا ئەوڵەو سەدوە بۆ فورسانی
بە دوو کاوڕ بگرن جێی میشێ
بنێ ئەوان خۆشە "حەنیفی" لە "منا"
زیمحی تۆ بێت و ملی ڕاکێشێ
بیر دەبێ دارو کەبێن بەی دیوە
کەڕەتێ بازی لەسەر هەڵنیشێ
قەدەمت هاتە لەمن بوو بە نەهات
نەشتەرێک بوو لەدڵی دام نیشێ
دڵی من کون کونی ئەو نەشتەرەیە
تەشەنی کردووە جەرگم دێشێ
تا دڵێ قدهرە لەگەڵ من گەردوون
تا سەروماڵ بکەمە گاوگەردوون
شەنای ڕەحمەتی "بین الحرمین"
وەکوو تەشخیسی دەدەن ئەهلی حاڵ
لە"صفا" و"مروه" "منا" و"مردلفه"
واجب و موستەحەب و بەرزوچاڵ
کزەبەک لەو شنەیەت بێ بەنەسیب
شارەزاتر لەدەلیل و ئاواڵ
گەرچی حەج فەرزە بەعومرێ جارێک
لێت قەبووڵ بێ بەتەوافی سەدساڵ
لە شەڕوتیری بەلای چەرخی چەموش
کێوی "ثور" و"احد"ت ببنە مەتاڵ
شادی بە خۆشی بە جێژنی ڕەمەزان
شینە شادی من وشیرینیم تاڵ
بەتەمام سێبەری پیرۆزی هومای
ئەوجەلیش بێتە سەرم لێکدا باڵ

نا یەلێ قەهرە لەگەڵ من گەردوو ن
تا سەروماڵ بکەمە گاوگەردوو ن

لەحەجی "متعە" دڵت تەشمینە
سەرەتای دینی مەدینەی دینە

بارەگای خەتمی روسوڵ مینبەروبەیت
جەننەتە رەوزە مەلەک پەرژینە

مەقسەدی وەحیە مەسیری جەبریل
مەرکەزی عیززەتە جێی تەمکینە

لەرەسوولانی "اولوالعزم" وخەواس
سەفی ئەرواح لەوێ چین چینە

کاتێ دەستەونەزەری بن مطەکووت !
پادشایان و سەلاتین چینە ؟

کلەسوبحانی یە خاکی کەل و کێو
پەل وچێو عوود وگوڵ ونەسرینە

خۆڵی بەردەرکی بەدڵ جاڕوو کە
گەسک وئاو ، کاری موژەوئەسرینە

یادی یاران بکە لێت وەردەگرن
مەرکەزی رەئفەتە جێی بەخشینە

فیدیە بێ عەیبە ، خەتابارم من
بۆیە سەهمم نیە لەو ئایینە

نا یەلێ قەهرە لەگەڵ من گەردوو ن
تا سەروماڵ بکەمە گاوگەردوو ن

گوێ لە پەندم گرە کاکی شاعیر
چ لە نۆبە و مزە شاێ و کەرو تێر
وەکوو بیستوومە دەڵێن ئەو نامە
شعری هێمن نیە زۆر بێ تامە
نانی شاردێکی گەلێ بێ پێزە
خاوە بێ بیتە کزە بێ هێزە
چوون دەڵێ داری خەزایی ماوە
جا نەمابێ چیە چی قەوماوە؟
داری ئازادیە ریشەی لە دڵا
داری دی جێی لە تەنوور و لەکڵا
کۆلکە دارێکی رزیو با لاچێ
داخی ئەو دارە لە دڵ دەرناچێ
خۆ شەهیدی وەتەنیش دوو وسێ نین
لاپەڕەی دەفتەری مێژوو خوێنین
یەک و دوو نین وبنەی نایە شەهید
نیشتمان حوجەتە مێژوو شاهید
تا بزانی چیە شوێنی مەردان
خوێنی کوردانە پەڵەی سەر بەردان
بە گرین تازیە لەبۆیان مەگرن
نصی قورئانە شەهیدان نەمرن
ئەوەیە پەندی من و نامەی من
بۆ برا شاعیرەکەم کاک هێمن
سەری سەرکەوتووەکان بێ تووکە
بۆچی پێت وایە قسێکی سووکە
کەچەڵیش هەر وەکوو بارانی پەڵە
مەسەلەی زۆرە هەیا سیش کەچەڵە
ئاوەزووی هێمنیە تەوس و پلار
تووڕەیی عەیبە برای خۆتە هەزار

ئەو دەڵێ هێمن ومن هاودەردین
چونکە لێدان و هەڵاتن مەردین
عیللەتی چوونە وەشی بۆ کوێستان
مەسەلە فیل و هەوای هیندوستان
لەو هەرامانە نیە چۆتە کەرەج
لە ستوونێ بە ستوونێکە فەرەج
کاکی من بێنەوە بیرت کەم وبێش
لە گوڵستان سەفەری دوو دەروێش
نیشتنی بازی بەخت هەڵکەوتە
رێی وەها بۆ من و هێمن چەوتە
کەرەتێکی بە نەسیم گوتبوو
پێت بڵێ تازە لەجێی خۆت مەبزوو
گەلەکەی ناکە دنیا خەتەرە
پێ لەتاتی مەکەوە باسی سەرە
چونکە دنیاکە هەر ئەو دنیا بوو
وەکوو دیبووت لەوەپێش هەر وابوو
ئەوە بەینێکە چەرخ سووڕاوە
من کە لەو سوورە سەرم سوڕماوە
ئەوکەسەی چەرخی فەلەک بووتەختی
روو بەزوڵماتە ستێرەی بەختی
ئەوکەسەی تۆ لە دەسی دەربەدەری
وا نەوی کەوتە زەوی تەوقی سەری
تۆ گوتت نیوەیی رێی بەغدا بێ
بە پشووی ماوە لە "رۆژئاوا" بێ
لە پشووی ئاخری ئەوجار وەرەوە
دوژمنی نارەحەتت بۆ دەرەوە
وەرە با ئەو کەرەتەش بت بینم
شاعیری شۆخی رەزا شیرینم

وەرە بڕوانە دڵی خوێناوم
بۆ بنۆ بانی گلێنەی چاوم
لە حەقیقی بکە یادێک جار جار
چاوەڕێتم بە ئومێدی دیدار

"بۆکان - زستانی ١٣٥٧ "

جەنابی حاجی مامۆستا مەلاحەمەد

بەوەی کەم شافیعی رۆژی جەزایە
بە قورئانێ کەواهادی و موبینە

بەدڵ مەمنوونی تۆم چونکی گەیاندت
بەوەی کەم مەهبەتی رووحول ئەمینە

بەدینم دینی تۆ ئاواتە بۆ من
عەزیزەی من بەخزمەت شای مەدینە

ئەگەر بەینێکە مەحرووم لەخزمەت
من و تۆ هەردوو ئاواتن بەدینە

دەڵێن فەرمووی نەبی یا "سوهورەبرە"
قەسەم بەخوا ،نەبەرزانە ، نەکینە

مەحەببەت بازیاتربێ لە بەینا
بەدووی یەکدا هەموورۆژێم مەبینە

بڵیندی وگەورەییت لەخوا دەخوازم
زیارەت بەینە بەینە گشت ئەوینە

برۆ هەر تایفی دەوری حەرەم بە
بەسەربەرزی بژی لەوسەر زەمینە

نەسیبت بێ نەسیمی شاری یەسریب
ئەتۆ حەججت قەبووڵە لێم یەقینە

ئەتۆ مەولا منیش دەروێشی سالیک
موقەررەب بی لەخزمەت شای مەدینە

دەخوێنێ بولبولی تەبعی حەقیقی
بەخەرقێکی شرۆڵ و پینە پینە

دەمێکی دەشت و سەحرا سوورو شینە

قانوونی دنیا هەر وایە
خۆشی ناخۆشی لەدوایە
ئەو بانەی شاری بێ وێنە
ئەوساڵ چەشنی گۆمی خوێنە
ئەو بانەی وا خۆش و دڵگر
ئەو خەڵکی دڵ زیندوو و نەمر
"با"ی بابردی هەر"نە"ی ماوە
بۆ شین گێڕان هەر نەی ماوە
تەرزەی بۆمی پێدا باری
ون بوو شوێنی شوورەی شاری
لەو شارەی سەرسەوزو شینە
ئەجەل کردی وەک مەل چینە
بێ هیوامان کیژو لاوان
بەچکەی بێ تاوان بێ باوان
شەوی شایی بووک وزاوا
رۆژی هیوایان بوو ئاوا
خوێناوی بوو دەسرەی هەوری
پس پس بوو زنجیرەی دەوری
گوڵ پەڕپەڕ بوو بولبول ناڵێ
پەروانەم دی سووتا باڵی
بۆمی بەعسی جەرگی بڕین
خاراو تارای لێ هەڵدڕین
ئێستا گشت ئەو دارو چێوە
پەڵە و شوێنی خوێنی پێوە
خزم ودۆستی تازە و کۆنە
کوژران کێ ما بێژی چۆنە
با رەش پۆش بن هەورازو چڕ
شین گێڕبن کەوبارو کورکوڕ

بــی مەجنــوون با خــۆی رازێنــــێ
فــرمێسکــی شــەونــم بــڕژێنـــــێ

جەرگم سووتا بــەسکەم بــەحســـــی
یا خــوا مــالّ وێران بێ بەعســی

سرای بەرزم لەپاش تۆ من ئیتر سەر و سەفا ناکەم
بەمەرگی تۆ بەدڵ مەیلی کەژ و کێو چیا ناکەم
بەداخی تۆ وەها حەرگم براوە حەستەمە زینم
بەزامو ئێشەوە مەرگم دەوێ دەردم دەوا ناکەم
ئەوا دەشت وچیا شینەو لە خاکی نیشتمان شینە
وڵاتی کوردی غەمگینە دەڵێ تەرکی عەزا ناکەم
لەباغان پەرپەرن گوڵ بولبول وقومری دەناڵێنن
منی دڵ خەستە حا چۆن مەحشەری کوبرا بەپا ناکەم
هەوارچی تازیەدارن چادروچیغ رەشپۆش و خەمناکن
هەڵاڵە وسوێسنە دز ماون بە لالەی گەش بەقا ناکەم
هەوایە دەشت وسەحرا مەیلی کوێستانم لەلا بایە
هەوای تۆم تا لەسەردایە،هەوای ئاوو هەوا ناکەم
کەلاوی کردووە ئەستێری خەم بۆنێو کەلاوەی دڵ
هەموو شینگا زەلن خاکی پەتی تێدا پەیا ناکەم
فیراقی تۆم وەکوو " حج الوداعێ" دێتە بەر چاوی
ئەگەر فیدیەت دەوێ فەرموو بە غەیری سەرفیدا ناکەم
لەنێو گەل قاوی مەرگت شوێنەوارێکی وەهای دانا
لە خوێناوی خەما غەرقم ئەگەر چاکی ئەدا ناکەم
بەهارە وبولبولی باغی ئەدەب "هێمن"دەڵێ ئەوجار
لەباغان بۆگوڵی نەورەس ئیتر نەغمە ونەوا ناکەم
بەسروەم دێتە گوێ دەنگی سەلاح الدینی ئەییووبی
دەڵێ کوردێکی دڵسۆزی لە هۆزی خۆت جودا ناکەم
پەزارەو مەینەتت زۆر دی لەدنیا خاترت جەم بێ
خودا فەرموویەتی رەنجی عیبادم بێ جەزا ناکەم
وەکوو دیوانی تۆ " تاریک وروونە" ژینی من ئەمما
لەبەر ناڵەی جودایی تۆ،خەیانی خەم بەبا ناکەم
لەسەر کەیکی تەمەن شەم نایسێ جارێکی دی قوربان
ئەجەل مەودای نەدا دەیگوت بە عەهدی کەس وەفا ناکەم

" حەقیقی" چاوەڕێی دیداری تۆ بوو داخی داخـــاـــم
نەنیشتەوبارە بەختی من لەبەختی بەدنیا ناکەم

مەهاباد - ۱۳۶۵/۱/۳۰"

کەوو کوڕکوڕ لەسەر دوندی چیای شین
دەناڵێنن لە شینی مەرگی هێمن

لە باغان بولبولی غەمگین دەناڵێ
دەڵێ لەو شیعر و هەڵبەستم دەوێ من

گوڵی باغی ئەدەب ژاکا لە ناکاو
بەبێ وی زەردە رەنگم وەک بەهێ من

لەنێو باغی گوڵان شەونم دەباری
دەڵێی فرمێسکە دیتم دوێ شەوێ من

وەهای دادا هەور بارانی ئەسرین
بەراوو شینە هەرچی ویشکەدێمن

بنەوبارگەی تەمەنمان گەییە ئاسۆ
لەوێ ئەو تێ پەڕی ماوم بەجێ من

لە دووی ئامانجی دڵ نەسرەوت و رۆیی
لەژانی ئەو دڵم چۆن بسرەوێ من ؟

لەپاش تۆ شاعیری بەرزو بەرێزم!
قەت ئاواتی دڵم نایێتە جێ من

لە دووریت تازە دڵخۆش بم محاڵە
بەنەغمەی بولبول و قاسپەی کەوێ من

بەبێ تۆ جەرگی من سووتاوە "هێمن" !
ئەمن ئاوام .ئەتۆ چۆنی بەبێ من

رەفیقان !دڵ بریندارە " حەقیقی "
دەوای ئەو زامە داوا کەم لەکێ من

---

ئەم هەڵبەستە بۆ شین گێڕی کۆچی دوایی مامۆستا هێمن لە شاری مەهاباد لە "مزگەوتی سوور" خوێندراوەتەوە .مامۆستای پایەبەرزی کورد هێمن لە ٢٩ی خاکەلێوەی ١٣٦٦ ی هەتاویدا لە شاری ورمێ کۆچی دوایی کردو لەشاری مەهاباد بەخاک ئەسپێردرا .

ئەو دەمەی دەشت و چیا رەنگین بوو
کێو وکەژ پڕ لەگوڵ ونەسرین بوو
بولبولی باغی ئەدەب گوڵچین بوو
لە کەمین دابوو خەزان غەمگین بوو
چیمەنی تافی جوانیت شین بوو
هەرەتی ژین بوو چ وادەی شین بوو
لە غەمت رەنگی خەزەڵوەر زەردە
دڵی دەی ئاوە ئەگەر وەک بەردە
بە تەبیبانی بڵێن بۆ پەردە
بۆچی دەرمانی نەبوو ئەو دەردە
چیمەنی تافی جوانیت شین بوو
هەرەتی ژین بوو چ وادەی شین بوو
لەشکری غەم بە دەروونم وەربوو
گڕی ئاور لە دڵ و گیان بەر بوو
مەرگی بێ وادەی تۆ مەحشەر بوو
ئێشی ئەو نێشە بەسەد خەنجەر بوو
چیمەنی تافی جوانیت شین بوو
هەرەتی ژین بوو چ وادەی شین بوو
لە دڵی باب و برا غەم بارە
لە هەموو شوێنەوە جێی تۆ دیارە
چیە ئەو شین و هەراو هاوارە
کۆچی بێ وادەی " کاکەسوارە "
چیمەنی تافی جوانیت شین بوو
هەرەتی ژین بوو چ وادەی شین بوو
خوێنە فرمێسکم و چاو بێ نوورە
بۆیە داوێنی فەلەک واسوورە
رۆژی روونم بە شەوی دەیجوورە
" سوارە" دیداری قیامەت دوورە

چیمەنی تافی جوانیت شین بوو
هەڕەتی ژین بوو چ وادەی شین بوو
بووی لەنێو باغی گولان تاقە گولێ
چ گولێ سەد خەم و سەد دەرد و دلێ
داخەکەم ئێستە " حەقیقی" چ بلێ
چاوو دڵ چۆن نەگری چۆن نەکولێ
چیمەنی تافی جوانیـن شین بوو
هەڕەتی ژین بوو چ وادەی شین بوو*

ئەم شیعرە لە شین گێری سوارەی ئیلخانی زادە ،پێشەوای ڕێبازی شیعری نوێ لە کوردستانی ئێراندا گوتراوە. سوارە لە ساڵی ١٣٥۴ی هەتاوی لە تەمەنی ٣٧ ساڵی دا جوانەمەرگ بوو و بەو کۆچە بێ وادەیە نەمامی سەرسەوزی شیعری نوێ بێ باغەوان مایەوە

لە کوێن ئامادەکانی خزمەتی دیـــن
لەبەرکەن کوێن و سۆرانی بکەن شیـــن
لەکوێن ئەو باب و مامانەی کەدوێنێ
بەشی وان بوو بەتەنیا عیزز وتەمکیـــن
لەکوێن کۆ ببنەوە عێـل وعەشیــرەت
ئەوانەی تالبی نێوبانگی بـەرزیـــن
ببینن چۆن شەمی گـەلیــان کـــوژاوە
چلۆن سووتا وەکوو پەروانە پەرویـــن
لە مەرگی "موهتەدی" هاونێوی"صدیــق "
فەلەک دەگری ،مەلەک بۆچی نەکا شیـــن
کوڕی هاونێوی "بەستامی" بلێ کـێ ؟
کتێبی جلدی پێنجی نـاشــری دیـــن
بەهۆی فرمێسکی خـوێنیـن لالـە سـوورە
لەحاندی جەرگی رەش،داماوە نەسریـــن
عەزیزم ! مەرگی بێ وادەت لە ناکاو
لە نەیزاری دڵانی دا گـڕ و تیـــن
خەمت شادی بــەزێــن و دڵتـــەزێنـــە
عەزا بۆ کۆتەڵتئەسپان دەکا زیـــن
شەل و کوێر وفەقیران بێ پەنا، مـان
هەتیو ماون ، سەغیرباران و مسکیـــن
بە حەق ئەو ئیرسە هەر بۆتۆ بەجێ مـا
سیفاتی یاری غاری سەروەری دیـــن
گەلێ مزگەوت و میحرابت بینـا نـــا
لە بۆ دینی موبین و شەرع و ئـاییـــن
ئەتۆ و مردن ، ئەتۆ مردن محالـــە
ئەوانەی ئەهلی عیرفان و مـەعـانیـــن

دەڵێن : قەت نامرێ مەردی نکوو نام
کە خێراتی ،حەیاتی جاوبدانیـــن
وەپێشت خستووە تێشووی قیامـــەت
گوڵی و ئاکارەکانت بوونە پەرژیـــن
لە چاکەی جی خودا فەرمووبـە کـــردت
لە رێی حەقدا ، خودا بت بەخشێ ئامین
" کرام‌الکاتبین " نووسی لە نامەت
سەوابت بۆ " لقاء‌الله"یـە کـافیـــن
لەپاش تۆ ئەی گوڵی باغی سەداقـــەت
ئەتۆخوا پێم‌بڵێ مێهر ووەفا چیـــن
حەقیقی ! ئولفەتی رۆژانـــــــی لاوی
بە پیریش‌هەروەها گەرمە ودەدا تین

ئەم پارچە هەڵبەستەی لەشین گێڕی حاجی ئەبووبەکری موهتە ـ دیدا گوتووە.خوالێخوشبوو حاجی ئەبووبەکرئاغا کوڕی حاجـــی بایزئاغای ئێلخانی بوو. بنەماڵەی ئێلخانی (موهتەدی) لـــە ناوچەی بۆکان دا زۆر بەناوبانگن وپیاوی گەورەیـــان زۆر لێ هەڵکەوتووە. حاجی ئەبووبەکرئاغا زۆر سەخی وبەدڵ ودەروون بوو. زۆر خواناس و بەئیمان بوو وزۆری یارمەتی فـەقیـــر و لێ قەوماوان دەکرد و لە موکریان دا زۆر بەناوبانگ وهەڵکەوتوو بوو.

ئەو مێرخاسە لە ساڵی١٣٦٦ی هەتاویدا لەشاری بـۆکـان کۆچی دوایی کرد.

هەی بێنە شەراب و کاسەکەی لێ پڕکەن
زانیوتە چیە تێی کەن و حۆی لێ مڕکەن ؟
هێندێک تولۆخە و تریّ ڕەشە و کەرخنکێن
شێلاویە بە پێخواسی جوێکی...کەن

بڕوانە سەروسەکوت ودەم و لەوسی مەس
لاکەی سەری دێ بۆکەنە ،عومری سەگی هەس
مەیخانەچی وەک جوو خمی لێ شێواوە
مەی تێ کەر ومەس دەبێتە هەرکەس هەرکەس

چایچی وەرە چای تازەدەمم بۆ بێنە
دەم خونچەگولێم دەمێ دەمم بۆ بێنە
گەر شێخ ومەلا بەسێوو مێو هەڵخەڵەتان
من شێتی شەمامەتم مەمم بۆ بێنە

چاو مەستە بەیانە ڕاپەڕە هەستە لەخەو
بۆم لادە لەسەر روومەتی رۆژ بەرچەمی شەو
چای دەمکە بنێ دەمم دولێوی قەندت
گوێ هەڵخە لەدەنگی بولبول وقاسپەی کەو

چایچی وەرە بەو پەنجەوفینجانی بلوور
چای تێکە نەڕەش بێت و نەزەرد،خالس سوور
شیرین کە دەمم بنێ دەمم قەندی دەم
نەشئەم کە بە یەک چای ودوچاوی مەخموور

چایچی وەرە چای تێکە نەوێژی چای چی
باسی کەروگا بەسیە کەری چی گای چی
کەللەی دەهەزار قەیسەر و دارا بووە خاک
خۆڵت وەسەری قەیسەری چی دارای چی

چایچی ڕەمەزانە ویشتە سۆفی گێژن
چا خواردنەوەم دەگاتە سێسەد ئێژن
سی روژە لەبۆم تێکە زەمێ سێ چایی
با سیشی قەرز بێ تاکوو رۆژی جێژن

بۆم پڕکە سەماوەرێ لە ئاوی سیروان
بۆم بێنە لە چای ئاخپەڕ و قەندی شیروان
تاق لێ مەدە دیوتە تاقی کیسرا رووخا
ئەو عومرە وەفای نییە نەما نۆشیروان

دنیا کە تیا ژیانی شێوو وەردە
هەم شیرن و تاڵە هەم شیفا هەم دەردە
داخۆ چیە چاندووتە چ دەدرووییەوە لێی
داخۆ چ دەبێ بەرهەمی ئەو شێوەردە

دنیا کە تیامانی کش و ماتێکە
سەدساڵی ئەگەر تیا بژی ساتێکە
رابردوو نەما نەهاتوو نازانی چیە
ئەو هاتن و چوونە هەر یەک ئافاتێکە

بارام کە بەور سڵ بوولەشوێنی گۆڕی
چەرخێکی فەلەک نەشان نە شوێنی گۆڕی
لەو رۆژەوە نیشتە سەرملی بەوری ئەجەل
نە شوێنێ لە بارامە نە شوێنی گۆڕی

عومرێکی ئەمانەتی بە خۆڕایی چوو
فایدەی چی پەشیمانی بە پەککوو ،پەککوو
بۆ کوێ دەچی بۆ هاتی ئەرێ چت بە چ کرد
نەقدێ بوو لەدەس دەرچوو بەهیچی یا هوو

خۆت باخەبەری لە کردەوەو ئاکارم
زۆر نامەسیام خراپە کار و بارم
غەیری کەرەمت هومێدی دیکەم نیە من
ناگاتە کەسی دی غەیری تۆ هاوارم

سەدخۆزگە دەمێکی تۆوی گەنمی دەڕوا
باپیرە بە شەیتانی نەبووبا بڕوا
لەوساوە منالێدا کەواو بابە دەمێ
رۆژێ لە شەوی رەشترە هەر دێ و دەڕوا

چایچی وەرە چای دەمکە نەکەی باسی مـــەی
ئەفسانەیە مـــەی،کـۆنـەپـەرستـی تـا کـەی
کەی کێ بوو، چلۆن بووکەی بووە، خوسرەوی کەی
قەت‌خۆ مەکە ماندوو بەکەی و مەی تا هەی

تا فەسڵی بەهارە باغ و دەم چەم خۆشـــە
شیـر و شەکەر و شەوو شەم و مـەم خـۆشـــە
هەمدەم سەنەمێ خونچە دەمێ چاومەستـــێ
دوو مەم بە دوو دەست‌ودەم لەسەر دەم خۆشە

دەرمانی هەمـوو دەرد و خەمێکە چایـــی
ئاکامی هەموو زەم و دەمێکـە چـــایـــی
چـای دەمکـە دەمێک‌ودەم بنێ نێو دەمی یار
دەمسازی هەموو خونچە دەمێکـــە چـــایـــی

شەوگاری درێژی پـایـز و رۆژی بـــەهـــار
زۆر کورت‌و کەمن ئەگەر لەگەڵتا بێ یـــار
چاییش یەک و دووی زۆرکەمە مەشهوورەدەڵێن
یەک کەم، دووخەمە، سێژەمە، بۆم تێکە چوار

دەرمانی هەڵامەتێ حـەب و دەرزی نیـــــن
چای دەمکە بەزەنجەفیل و هێـل و دارچیـــن
زستانە ئەگەر، بـرۆ لە کورسی بخـــزێ
عـارەق بڕژێنە نێوە نێوە و چیـن چیـــن

خـزم وکەس‌وکار و باب‌و باپیری ئـــەوان
هەرکەس‌کە ببێ لە شاو گەداو پیر و جەوان
رۆژێکی دەبێ بچێتـــەوە شـاری عـــــەدەم
سەد حەیف‌کوڕ و نەوەی ئەوان هەر لەخەوان

رۆژانی ژیان هەڵاتنـە و ئـاوا بـــوون
رێگایەکە دایـک‌و بـابـی تۆی پێـداچوون
ئەو ماوە کەمەی بە تـاڵـی رامـەبوێـرە
بێهـوودەیـە خواردنی خەمی بـوون ونەبوون

تۆ حاوەی و حاسەختو منیش میوانم
بۆ هەر شتێ رێم نیشان نەدەی سازانم
لێم سوورە دەسووری لە گوناهم چونکە
لێت سوورە کە من بە تۆ هەیە ئیمانم

رەحمان و رەحیمی بە غەزەب مەمبینە
زۆر دوورە لە رەحم و میهرەبانی کینە
من عەبدی گونەهکارم و تۆ بەخشندەی
بمبەخشە نیشانەی کەرەمێ بەخشینە

سەد شوکری بکەی ئەگەر بە هەنگاوێکی
قەت ماندوو نەبی لە تاعەتی تاوێکی
سیفرێکە لە راستی نیعمەتی دوو گوێچکە
نیوسیفرە لە شوکری نیعمەتی چاوێکی

شێخێ بەژنێکی فاحشەی گوت مەستی
هەرتاوە بەدەس یەکێکەوەی ناوەستی
پێی گوت بەلێ من وەکوو دەفەرمووی ئاوام
تۆ چون؟وەکوو خۆ نیشان دەدەی بێ هەستی (١) ؟

گوێ بگرە لەگەڵ تۆمە رەفیقی گیانی
رووخۆش و زمان خۆش بە لەگەڵ میوانی
ساردی و سڕی وو دڕی بەشی حەیوانە
خۆ دوور خەرەوە لەوانە تۆ ئینسانی

داخ و کەسەرت ئەگەر یەکە مەیکە بە دوو
خەم بێ سەمەرە لەدووی شتی رابردوو
چت چاندووە توو،هەر ئەوی لێ هەڵدەگری
ئاواتی عەبەس خەیاری ناکاتە کەدوو

پێت خۆشە نەبینی هەیبەتی رۆژی بەرێ
دووربی لە بەڵای زاڵم وفیتنە و خەتەرێ
پێویستە لەگەڵ خەڵکی زمانت خۆش بێ
چون مار بەزمانی خۆش لەکون دێتە دەرێ

١- ئەم چوارینە وەرگێڕاوی شیعری خەیامە

ئای لەو هەموو نیعمەتە تەماشا چاو چاو

سەد جۆرە غەزاو میوە لەگەڵ نان وئاو

شوکری کەرەمت چلۆن بەمن دەژمێرێ

ئەی ئەوکەسی تۆ داوتە بەمن گوێچکە وچاو



## کۆچی بەشەو

مانگی گولانی هەزار وچوار سەد وحەوتە
ئایەتی "مازاغ" باسی چاوی بە خەوتە
نووری جەمالت جیهانی کردە چراغان
رۆژی هەلاتووی چ هەولی کۆچی بەشەوتە

بۆکان ـ بانەمەڕی ـ ٦٦

## داری تەمەن

بە توانجی لچ و لێو ، چاو و برۆ
رۆژگار قەلسە دەگێرێ لە مرۆ
گەرچی گەندەڵ بووە داری تەمەنم
دەردەکا مانگی گولان وردە چرۆ

بۆکان ـ بانەمەڕی ٦٦

## تووکی شۆڕەتی

کەوتم دەسم شکاو بە عەمەل ڕۆیی حوکمی چاو
باوم نەماوە باوە، بەفوو بەندە عومری ماو
تەنیا لەمن کراوە دەلێی تووکی شۆڕەتی
ئێستا بە چاوی کوێرەوە دەگرم دەسی شکاو

بۆکان - ٦١

## شاعیرنوما

نەکەی باوەڕ بەوەی شاعیر نومایە
نە سەرمایەی هەیە چونکە نەمایە
دزیت بۆ هەڵدەڕێژێ پڕ بە تێری
لەبەر خۆی شینی ئاواڵان دەگێڕێ

## هەرمێشک

نانی برشتە و کەرەی دۆ لەسەر
لەگەڵ لە مەشکە وتەنوور هاتە دەر
تێکی هەڵشێلە و بیکە هەرمێشک
بیخۆ قازانجە بۆ خوێن و مێشک

**نام کتاب :** دیوان حقیقی

**نویسنده :** عباس حقیقی

**ناشر :** مرکز نشر فرهنگ و ادبیات کردی
(انتشارات صلاح الدین ایوبـــــی)

**تیراژ :** ۳۰۰۰

**چاپ اول :** ۱۳۶۷

